# بەربەستەکانی گەشەسەندنی سیاسی

نووسینی

عەبدول عەلی قەوام

وەرگێڕانی

هیوا مەجید خەلیل






دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


## بەربەستەکانی گەشەسەندنی سیاسی


- نووسینی: عەبدول عەلی قەوام
- وەرگێڕانی: هیوا مەجید خەلیل
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ٩٢٤
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٣٨٧)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com




ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە:

بانو

# ناوەرۆك

# پێشەکی

گەشەی سیاسی یەکێك لەو چەمکانەیە کە ڕەگەزگەری دژبەیەکی لەخۆ گرتووە و کاتێك کە بەسەر یەکەی سیاسی (واتە دەوڵەت) دەچەسپێت. ئەم دژبەیەکییە ئاشکرا دەبێت.

بۆیە پلان دارێژەر و بەڕێوەبەرانی پرۆژەی گەشەسەندنی سیاسی بەردەوام لەگەڵ ئەم دۆخە لوغزاوییە لە مشتومڕدان. لە هەندێ شوێن بە هۆی لەبار بوونی بواری کولتووریی و مێژوویی جێبەجێ کردنی پلانەکانی گەشەسەندنی سیاسی ڕووبەڕووی گرفتگەلی کەمتر دەبنەوە و لە هەندێ شوێنیدا بەدرێژایی مێژوو بە هۆی یەکلایی نەکردنەوەی پرسی بەها نۆرمەکان ئەم پرۆسەیە زۆر لەسەر خۆ بەڕێوە دەچێت بۆ ئەوەی کە سیستەمی سیاسی بتوانێت وەڵامی داواکارییە ڕوو لەزیاد بوونی هاووڵاتیان بداتەوە، پێویستە بە جیددی بەرەو پرۆسەی (گەشەسەندنی سیاسی) هەنگاو بنێت و سەرەڕای چاکسازی و وەرچەخان لە ستراکتۆری کولتووری، سیاسی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگا، پەرە بە توانای و لێهاتوویی خۆشی بۆ پێشکەش کردنی داتای گونجاو بدات.

گوزار لە پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسی، زۆر سەخت و ئاڵۆز و هەندێ جاریش نیگەرانی دروستدەکات. چونکە پێویستە لەم ڕێڕەوەدا، بە بوێرانە ڕووبەڕووی دژبەیەکی جۆراجۆر کەبە واقیعیەتی ژیانی سیاسی هەژمار دەکرێن، ببینەوە و بە بەرەنگاربوونەوەیان ناکۆکییەکانی بەوپەری کەمی بگەیێنین چونکە گەشەسەندن لە گشت شێواز و ڕەهەندکانیەوە دژی سیاسەتی پارێزگاری لە بارودۆخی بەرقەرارە، بۆیە دەبێتە هۆی لە هەمبەریەك وەستانی لایەنگرانی پاراستنی بارودۆخی بەرقەرار و ئەو لایەنگرانەی کە پشتگیری لە گۆڕینی بارودۆخی بەرقەراردەکەن.

پەرەسەندنی تەنگژەکان تەنیا بە هۆی چوونە ناوەوەی پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسی نییە. بەڵکو زۆرجار گەشەی ئابووری و جوڵای کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی دروستکردنی ناکۆکی لە نێوان گرووپەکان، سەرەڕای سەرهەڵدانی هێزگەلی نوێ،



گرووپەکانی پێشوو ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە. بەم جۆرەش بۆ گرووپەکانی خوارووی کۆمەڵگا دەرفەت بۆ باشترکردنی دۆخەکەیان دەرەخسێت ناکۆکی کۆمەڵایەتی لە نێوان چین، ناوچە و توێژەکان، هوشیاریی گرووپی دروستدەکات و ئەمەش گرتنەبەری هەڵوێستی دەستەجەمعی لەلایەن گرووپێکەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکەیان لەدژی گرووپێکی تری لێدەکەوێتەوە و کۆی ئەم بزافانەش دەبێتە هۆی ئاراستە بوونی کۆمەڵگا بەرەو سیاسەت (کردن).

لە لایەکیترەوە، ئاڵۆزتر بوونی سیستەمی ئابووری، ئیمکاناتی زۆرتر بۆ بەشداریکردنی خەڵك لە گرووپ و ڕێکخراوەکاندا فەراهەم دەکات. لەژێر ئەم چەشنە باردۆخەدا، بە هۆی فرە ستراکتۆرییەوە، ئۆرگان و کەناڵی جۆراوجۆر بۆ دەربڕینی داواکارییەکان و گۆڕینی بەرژەوەندییەکان بۆ سیاسەت سەر هەڵدەدەن.

بەم جۆرەش لە پرۆسەی گەشەسەندندا مامەڵەی نێوان ستراکتۆرەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئابوورە سیاسەت و کولتووری بەرێژەی جیاواز لە سەر یەکتر کاریگەری بنوێنن و بڕیارەکانی تایبەت بە هەریەك لەم ستراکتۆرانەی کاریگەری لەسەر پانتایی ستراکتۆرەکەیتر دابنێت. بەم پێیەش گەشەی ئابووری تارادەیەك یارمەتی بەرفراوان بوونی کارکردەکانی حکوومەت دەدات و لەم پرۆسەیەشدا هەرچەند هەڵسوکەوتی حکوومەت زۆرتر ژیانی گرووپە جۆراجورەکانی کۆمەڵگا بێتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، ئاسەواریی ئەم هەڵسوکەوتە لەسەر کۆمەڵگا زەقتر دەبێت. لەم بارودۆخەدا هەرچەند خەڵك زۆرتر چالاك بن، باشتر دەتوانن داواکارییەکانیان لە بڕیار و سیاسەتەکانی حکوومەتدا ڕەنگ بدەنەوە.

بەرچاو کردنی ئەو شتانەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن، دەبینین کە نوێگەریی ئابووری و کۆمەلایەتی لە چوارچێوەی گەشەسەندنی نەتەوەیی بەرجەستە دەبێت.

بە واتایەکیتر لەم ڕێڕەوەدا حکوومەتی نیشتمانی بە ماشینی نوێگەریی کۆمەڵایەتی ئابووری و سیاسی هەژمار دەکرێت. لەم چەشنە بارودۆخەدا پەیوەندی





گەل و حکوومەتی نیشتمانی پتەوتر دەبێت و لە ئەنجامدا وەفادارێتی تاکەکەس، سنووردار و خۆجییێی بۆ وەفادارێتی نیشتمانی دەگۆڕدرێت کە ئەمەش دەتوانرێت ببێت بە رێگە خۆشکەریی بەشداریی سیاسی.

هەروەك ئاماژەمان بۆ کرد پلانەکانی گەشەسەندن بەگشتی و گەشەی سیاسیش بەتایبەتی رووبەڕووی بەربەستی جۆراوجور دەبنەوە، لێرەدایە کە لێهاتوویی و هونەری بەڕێوەبردنی سیاسی دەخرێتە بەردەم مەحکی تاقیکردنەوەدا. لە ناکوکییە باوەکان و تەحەددییەکانن دەکرێت ئاماژە بەو خالآنەی خوارەوە بدەین:

- لە هەمبەر یەك وەستانی سوننەتگەرایی و مودێرنیزم.
- کەڵەکە بوونی دەسەلآت و دووبارە دابەشکردنەوەی.
- پۆلۆرالیزم لە هەمبەر نافرەیی بوونی (تنوع) سیستەمی سیاسی.
- گەورەکردنی دەولّەت و بچووك هەژمار کردنی کۆمەلّگا.
- بەرز بوونی (رێژەیی) بەشداریی سیاسی و هاوبەشکردنی ئەوانیتر لە دەسەلآتدا، لەبەرامبەر دابەزینی و لەدەستدانی دەسەلآت لە لایەن دەسەلآتدارانی پێشوو.
- گەشەی ئابووری بە هۆی سەرمایەگوزاریی دەرەکی و زیاد بوونی رۆڵی کۆمپانیا فرە رەگەزەکان لە کاروباری ئابووری، سیاسی و کۆمەلآیەتی، لە هەمبەر سیاسەتی وابەستە نەبوون (عدم التبیعە).
- پە یرەوی کردنی سیاسەتی ناوەندگەرایی و بەهێزکردنی سیستەمی پلەبەندی (سلسلە مراتب) لەهەمبەر گەشەی ئیداریی لە رێگەی پەیرەوی نەکردنی (سیستەمی) پلەبەندی لە ستراکتۆریی ئیداری، هەرێم گەرایی، سپاردنی دەسەلآت و بەهێزکردنی سیستەمی ئیداریی بەشداریکردن.
- فەراهەم کردنی زەمینەی لەبار بۆ بەرزکردنەوەی هۆشیاری گشتی و ئالّ و گۆڕی ئازادانەی زانیارییەکان، لە هەمبەر شۆڕشی زیادبوونی داواکارییەکان و خێرابوونی مەشروعییەت.



ستراکتۆریی و سەربەخۆیی رێژەیی سیستەمە لاوەکییەکان ( SUB SYSTEM)، لەهەمبەر دژ بە یەك بوونی بەهاکان، گەورەکردنی دەولّەت و بەکارهێنانی توند و تیژی و سیاسەتی سەرکوتکردن و تۆقاندن.

بە پێی شیکردنەوەی سەرەوە دەبینین کە پانتایی گەشەسەندن، پانتای بەریەك کەوتنی را، هزر، بڕوا، سیمبول، نۆرم و ئەولەوییەتەکانە و بە هۆی بەهایی بوونی گەشەسەندنی سیاسییەوە، ئەم دژ بەیەك بوون و جیاوازییانە {لە پانتایی سیاسیدا} زەقترە بە بەراورد لەگەلّ پانتای ئابووری. هەر بۆیەش تەنیا لە رێگەی پلانێکی لۆژیکانە و راست و دروست و واقیعگەرایانە، ئامانجەکانی گەشەسەندن دەستەبەر دەکرێن. ئامانجگەلێك کە بە ئاراستەی بەرز کردنەوەی ئاستی کولتوور، مرۆڤایەتیکردنی کۆمەلّگا، متمانە، هاوکاریی، هۆشیاریی و وەلآمدانەی پێداویستییە سیاسی، ئابووری و کۆمەلآیەتییەکانی رۆژانەیی کۆمەلّگابێت.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا کە رووبەڕووی خێرایی جیهانی بوون بووینەتەوە، سەرەڕایی ئەو تەحەددییانەی کە لە چوارچێوەی سیستەمی سیاسیدا هەن، شایەتی زنجیرە لۆغز و جیاوازیگەلێکن لە کارکردنی دەولّەتان سەبارت بە گەشەسەندنی سیاسی و پرۆسەی جیهانی بوون. لە کاتێکدا کە هەریەك لە یەکە سیاسییەکان نموونە و ستراتیژی تایبەتیان بۆ گەشەسەندن بەگشتی و گەشەی سیاسی بە تایبەتی پەیرەو دەکەن، پێودانگ و خەسلّەتەکانی گەشەسەندن لە چوارچێوەی جیهانی بووندا جیاواز و هەندێ جاریش دژ بەیەکن، هەروەها لەهەل و مەرجێکدا کە کۆمەلّگاکان هەولّی چارەسەرکردنی قەیرانگەی جۆراوجۆری وەك مەشروعییەت، دەستڕۆیی، بەشداریی، شوناس، دابەشکردن، یەکپارچەیی دەدات، بەلآم هێزەکانی جیهانی بوون کە هاوکاتە بە دابەزینی رۆڵی کلاسیکی دەولّەت، لەرزۆك بوونی سنووره جوگرافییەکان، سنووردارکردنی سەروەریی، لێکترازانی کۆمەلآیەتی و جیاخوازیی، فرە ناوەندگەرایی (هەرێم گەرایی) و پەرەسەندنی ئەم قەیرانانە، دژی هەولّی ئەو کۆمەلّگاکانە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئاماژە پێکراوەکان. بەم جۆرەش





دژ بەیەك وەستانی ڕەوتی جیهانی بوون و ستراتیژییەکانی گەشەسەندن لە چوارچێوەی دەوڵەت. نەتەوە دەتوانێت خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی گەشەسەندنی سیاسی لە کۆمەڵگا لێك جیاوازەکاندا دەستنیشان بکات. یەکێك لە ئاسەواری ئەم تەحەدییە و هەموارکردنی نموونە (نموذج)کانی گەشەی سیاسی ئەویش بەپێی پێناسەگەلی نوێ لە مەشروعییەت، دەسەڵات، بەرژەوەندی، کۆمەڵگا و دەوڵەت بە پێی ئەم شیکردنەوەیە پێداچوونەوەی پەیوەندی نێوان هاووڵاتی و حکوومەت کرا و تێڕامانی ئێمەی بۆ گەشەسەندنی سیاسی گۆڕانی بەسەردا دێت.

تەنگ و چەڵەمەی میتۆدەکان لە خوێندنەوەی گەشەسەندنی سیاسیدا بابەتی گەشەی سیاسی لە کۆتایی ١٩٥٠ و سەرەتای ١٩٦٠ لە چوارچێوەی خوێندنەوەی سیاسەتی بەراوردکاریی سەرنجی زانایانی زانستە رامیارییەکانی راکێشا هەڵبەت پێش شەڕی دووەمی جیهانی بەتایبەتیش لە ساڵانی ١٩٢٠و ١٩٣٠ توێژەر و فەیلەسووفانی سیاسی هەوڵیاندا بە پێی گۆڕان و وەرچەخانە کۆمەڵایەتییەکان بابەتی گەشەی سیاسی شیبکەنەوە. لە ساڵانی ئاماژە پێکراودا روانینی زانایان رەشبینانە بوو، بە چەشنێك کە ئەوان کۆتایی هەر شارستانییەتێکیان بەتایبەتیش شارستانییەتی  رۆژئاوا، هەرەسهێنان و پووکانەوە دەزانی و لەو بڕوایەدا بوون کە ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە رەوتی بە پیشەسازیی بوون و نویگەراییدا بەدیهاتن، زنجیرە قەیرانێکی وەك لە خۆ بێگانە بوون و لێکترازانی کۆمەڵایەتی لێکەوتەوە.

پاش شەڕی دووەمی جیهانی بە خۆش بینییەوە سەیری رەوتی گەشەی سیاسی و گۆرانکارییە کۆمەڵایەتییەکان کرا و توێژەران لە ژێر کاریگەری سەرکەوتن و بووژانەوەی ئابووری کە رۆژئاوا بەتایبەتیش ولایەتە یەکگرتووەکان بە دەستی هێنابوو، لە رەهەندێکی پۆزەتیڤانەوە ئەم بابەتەیان شیکردەوە.

چونکە کەشی زاڵ بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا لە چوارچێوەی شەڕی ساردی نێوان دوو جەمسەری سەرمایەداری و سۆسیالیزمدا بوو، بۆیە توێژەرە رۆژئاواییەکانی لە ژێر کاریگەری ئەم بارودۆخەدا نموونە و تیۆرگەلێکیان سەبارەت بە



گەشەسەندنی سیاسی پێشکەش کرد کە سیمای ئایدیۆلۆژیکیان پێوە دیار بوو و رەنگدانەوەی وەرچەرخان و گۆڕرانکارییەکانی جیهانی رۆژئاوا بوون.

فاکتەر و پاڵنەرگەلی جۆراوجۆر لە دارشتنی تیۆرییەکانی گەشەسەندنی سیاسی و رەوتی نۆیگەریی کاریگەر بوون کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

١- سەقامگیریی سیستەمی دوو جەمسەریی و مشتومڕی نێوان سۆسیالیزم و سەرمایەداری.

٢- پەرەسەندنی بزاڤە سۆسیالیستەکان، پارتە کۆمۆنیستەکان لە جیهانی سێیەم و وڵاتانی سەرمایەداری ئەوروپا، هەروەها سەقامگیر بوونی دیموکراسی جەماوەری (کۆمەڵی) لە وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات.

٣- بزاڤی مەکارتیزم لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

٤- رەوتی روو لە پەرەسەندنی بزاڤە رزگاریخواز و سەربەخۆخوازەکان لە کۆلۆنەکاندا.

٥- زیاد بوونی ژمارەی یەکە سیاسییەکانی سەربەخۆ لە جیهاندا

٦- دامەزراندنی بزاڤی بێ لایەن (عدم الانحیاز) و تێکدانی سیستەمی هاوسەنگی لە نێوان زلهێزەکاندا.

بەم چەشنە گۆرانکارییەکانی شەڕی سارد پانتای زانکۆیی و رۆشنبیریی رۆژئاوایی خستە ژێر کاریگەرییەوە و زۆرێك لە توێژەرانی زانستە رامیارییەکان هەوڵیاندا پارێزگاری لە ئاسایش و ساغڵەمی ژیانی ئاکادیمیکی بکەن.

لە کاتێکدا کە تیۆرداڕێژەرانی رۆژئاوا شێوازی گەشەسەندنی سەرمایەدارییانەیان بۆ وڵاتانی دامەزراویی جیهانی سێیەم پێشتیاز دەکرد، رۆژهەڵات شێوازی گەشەسەندنی ناسەرمایەداریی بۆ ئەم وڵاتانە نەیدەخستەڕوو.

لێکدانەوە پارێزگارییەکانی توێژەرانی رۆژئاوا لە بوارەکانی گەشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی، بەرپەرچدانەوەیێك بوو لە هەمبەر مەترسی سیاسەتە رادیکالییەکان. جێی ئاماژە پێدانە کە لە ساڵانی ١٩٥٠ دا، تاقمێك بە پێی پێداویستییە ئابوورییەکانی ناوخۆ و دەرەوە خوێندنەوەی گەشەسەندنی ئابوورییان





دەکرد، تاقمێکیتریش ئەم بابەتەیان لە چوارچێوەی شەڕی ساردا گەڵاڵە دەکرد. سەرەڕای جەخت کردنە سەری تیۆرداڕێژەرانی ڕۆژئاوا بۆ پەیڕەویی کردنی شێوازی سەرمایەداری لەلایەن وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە، بەڵام ئەم کەسانە دەیانزانی کە ئەو پرۆسەیەی دەوڵەتانی سەرمایەداری ڕۆژئاوا بە درێژایی چەندین سەدە بڕیویانە، کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەم ئەم ڕێگەیەیان نەبڕیوە، چونکە لە ڕۆژئاوادا گەشەسەندنی ئابووری سەرەتا لە چوارچێوەی سیستەمی سەرمایەداریدا بەدی هات و دواتر بەرە و پاش نەهێشتنی لەمپەرەکانی بەردەم ئەم پرۆسەیە ئاسەوارەکانی گەشەسەندنی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەرکەوتن.

بە بۆچوونی زۆرێك لە زانایانی ئابووری سیاسی، لە کاتێکدا کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، سەرەتایەك ڕێگەیان بۆ دەرباز بوون لە قۆناغی فیودالیزم بەرەو سەرمایەداری بڕیوە، بەڵام بە هاتنی کۆڵۆنیال بۆ ڕۆژهەڵات ئەم ڕیڕەوە سروشتییە لە ڕۆژهەڵاتدا پچڕا و لەم قۆناغەوە وڵاتانی جیهانی سێیەم ئەیانتوانی پەرە بە دامەزراوەکانی پێویست بۆ گەشەسەندنی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی بدەن.

لە ساڵانی ١٩٤٠و١٩٥٠ کاتێك کە باس لە گەشەسەندن دەکرا، مەبەست بووژانەوەی ئابووری بوو، واتە ڕەوتێك کە ببێتە هۆی زیاد بوونی داهات و بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی و باشتر بوونی ئاستی بژێوی ژیان بۆ کەسە بێ بەشکراوەکان لێ بکەوێتەوە. چونکە سەلمێنرا کە ناکارامەیی ستراکتۆرەکان و کارکردی سیستەمی سیاسی، بارودۆخێك دروستدەکات کە بەربەستە بۆ گەشەسەندنی ئابووری خوازراو.

تا سەرەتای ساڵانی ١٩٦٠ وەها بۆی دەچوون کە بە هۆی هاوبەندی لە نێوان کۆمەڵگاکان (بە هۆی پەرەسەندنی پەیوەندییەکان) ئەگەر بێتو بتوانرێت جیهانی سێیەم لە ڕووی دەروونییەوە هەروەك کۆمەڵگا پیشەسازییەکانی پێشکەوتوو، بە مودێرن هەژماربکرێن و یارمەتی ئابووری بدرێن، گەشەسەندنی سیاسی چاوەڕوانکراو بەدیدێت. لەم ئاراستەیەدا هەندێ لە زانایان وەها بۆی دەچوون کە بە هۆی ئەم گۆڕانکارییانەوە، سیستەمی سیاسی ئاڵۆزتر، خاوەن فرە (تنوع) ستراکتۆریی و دامەزراوەیەکی نوێ دەبێت و وەڵامی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا دەداتەوە.



سەرەڕای ئەم خۆش بینییە، لە پراکتیکدا بە ڕووخانی دامەزراوە کۆنەکان لە کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەمدا، یەکەم دامەزراوەگەلی نوێ دامەزراون و دووەم تەنانەت ئەگەر دامەزراوەگەلێکیش بنیاتنران، بە هۆی نەبوونی پەیوەندی و پێکەوە گونجان لە نێوان کارکردنی ئەم دامەزراوانە و پێداویستییە سەرەکییەکانی خەڵك، کارامەیی پێویستیان بۆ وەڵامدانەوەی داواکارییەکانی کۆمەڵگایان نەبوو. کۆی ئەم گۆڕانکارییانە نیشانیاندا کە نەتەنیا ئەم وەرچەرخانە بەدی نەهات، بەڵکو پاش دەرچوونی کۆڵۆنیال لەم ناوچەدا، بە هۆی نەبوونی ستراکتۆرگەلی کاراسە، سیستەمی سیاسی و کۆمەڵگا ڕوو بەڕووی پشێویی بوونەوە.

دەتوانین بڵێین کە هۆی ئەم شپرزەیی ئاکادیمیکی بوونی لوغز گەلێك لە گەڵاڵە کردنی بابەتی گەشەسەندن بوو، چونکە پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسی، لەلایەکەوە دەبێتە هۆی پەرەسەندنی بەشداریکردن و بەخشینی ڕۆڵی بڕیاردان بە ئاستە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا، لە لایەکیترەوە دووبارە دابەشکردنەوەی دەسەڵات و بنیاتنانەوەی دامەزراوەکان، لە ڕوانگەی تیۆرداڕێژەرانی ڕۆژ ئاوادا، تەندروستی کۆمەڵگای کۆمەڵی و دیموکراسی ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە، کە ئەمەش لێکدانەوەکانی پەیوەست بە تیۆری دیموکراسی دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیدا. بەم جۆرەش پێکدادانی ئایدیۆلۆژیکی، بە مانای دوور مانەوەی وڵاتانی جیهانی سێیەم لە دەستدرێژییەکانی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم دێت و پابەندنەبوونی {لەم ئایدیۆلۆژییانە لە هەمبەر جیهانی سێیەم} بۆ بە لەمپەرێك لە بەردەم توێژەران بۆ نەبینینی ڕاستییەکانی جیهانی سێیەم.

لە قۆناغەکانی دواتردا زۆرێك لە زانایانی زانستە ڕامیارییەکان هەوڵیاندا گەشەی سیاسی بە پێی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان لێکدانەوە بکەن. هەڵبەت گۆڕانکارییەکانی ڕەچاوکراو لەلایەن ئەم زانایانەوە بنەڕەتی نەبوون و ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە دەتوانن لەسەر دامەزراوە کۆنەکان، لە چوارچێوەی گۆڕانکاریی چاکسازییانە، دامەزراوەکەی نوێ بنیات بنێن. لەم ئاراستەیەدا گرنگترین بابەت کە ڕەچاوەدکرا سوننەتگەرایی لە هەمبەر نۆیگەرایی بوو.





چونکە بە بڕوای زۆرێك لە تیۆردارێژەرانی گەشەسەندنی سیاسی، بوونی ڕەگەز و دامەزراوە تەقلیدییەکان لە بەردەم گەشەسەندنی سیاسیدا. بۆیە مشت و مڕلە نێوان (سوننەت) و (مودێرن) سەری هەڵدا. شایانی باسکردنە کە تیۆردارێژەرانی ڕۆژهەلات (سۆسیالیستەکان) لە بری باسکردنی بابەتگەلی سوننەت و مۆدێرن، ئاماژەیان بە کۆمەڵگای (فیودالی) و (سەرمایەداری) و (نیمچە فیودالی) و (نیمچە سەرمایەداری) دەکرد.

هەڵبەت کاتێك کە لە سەرەتاکانی ١٩٧٠ دا گۆڕانکارییەك لە چەمکی گەشەسەندنی سیاسیدا ڕوویدا و ڕەخنەگرە لیبراڵ و ڕادیکالییەکان خوازیاری پیداچوونەوە لە پێناسەکردنی چەمکی گەشەسەندنی سیاسی بوونەوە، ئەوان دابەشکردنی کۆمەڵگا بە پێی سوننەت و مۆدێرن کە دەکرا ببێتە هۆی جۆرە دوو فاقێتییەك، ڕەتیانکردەوە. لێرەدا بوو کە ڕەخنە لە ڕوانگە نامێژوویی و دەمارگرژیی پارێزگارییانە گیرا. لەم قۆناغەدا هەندێ لەو بڕوایە دابوون کە پێویستە هاوکات لەگەڵ پاراستنی سوننەتەکان، بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئەم بارودۆخە گۆڕدراوەدا، هاوکات سوننەتەکان نۆی بکرێنەوە تا بەم شێوەیە سەرەڕای پاراستنی مەشروعییەتی سیستەمی سیاسی، ئاستی کارامەیی سیستەم لەڕووی بەرزکردنەوەی توانایی سیستەم بۆ وەڵامدانەوەی داواکارییەکانی خەڵك، بەرز بکرێتەوە.

ئەگەرچی لە ساڵانی ١٩٤٠و ١٩٥٠ ڕەهەندە ئابوورییەکانی گەشەسەندنی سیاسی ڕەچاو دەکرا، بەڵام لە کۆتایی ١٩٦٠ توێژەرانی زانستە سیاسییەکان لەهەمبەر فاکتەرە ئابوورییەکان گرنگی زۆرتریان بە پێودانگە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیدا. ئەمەش بەو ڕادەیە گەیشت کە توێژەرانی گەشەسەندنی سیاسی ترسی ئەوەیان هەبوو کە بۆ ڕوونکردنەوەی تیۆرییەکانیان بچنە ناو سنوورەکانی نزیك بوونەوەیان لە پرسە ئابوورییەکان تا ئەو ئاستە کە بە شێوەیەك لەشێوەکان ئەم نزیك بوونەوەیە پەیوەندی بە بابەتی گۆڕانکارییەوە هەبوو. بەچەشنێك کە ئەگەر پشتگیریی لە زانایەکی وەك (الت ڕۆستو) دەکرا، ئەم پشتگیرییە بە هۆی ڕوانگە سیاسی و



کۆمەڵایەتییەکانییەوە بوو. لە قۆناغەکانیتردا بە شێوەیەك لە شێوەکان چەمکی گەشەسەندنی سیاسی بە بابەتی (کولتووری سیاسی) گرێدرا. چونکە بە بۆچوونی تاقمێك لە زانایان ئەگەر بێتو لە ڕێگەی ڕاڤە و شیکردنەوەی کولتووری سیاسی کۆمەڵگاکان بگۆڕگەلێك بدۆزینەوە کە ئەم ڕەگەزانە بە ئاراستە بەکارهێنانی تواناییەکانی سیستەم بۆ وەڵامدانەوەی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا وەگەڕ بخرێن، دەتوانین چاوەڕوانی بەدیهاتنی گەشەسەندنی سیاسی خوازراو بکەین.

لە ساڵانی ١٩٧٠ وە هەندێ لە توێژەران، زۆرتر ڕەهەندی دەرەکی گەشەیان ڕەچاو دەکرد. لەم قۆناغەوە ئەم بابەتە زۆرتر لە چوارچێوەی تیۆرەکانی (گەشە نەسەندن) و (سەربەخۆیی و وابەستەیی) گەڵاڵەکرا. چونکە بە بڕوای هەندێ لە زانایان زنجیرە هۆکار گەلێکی دەرەکی واتە کۆلۆنیال و ئیمپریالیزم بوونەتە هۆی گەشەسەندنی وڵاتانی جیهانی سێیەم. هەڵبەت پێویستە لە بیر نەکرێت کە لەم قۆناغەدا دووبارە جەخت لە سەر ڕەهەندە ئابوورییەکانی گەشەی سیاسی کرایەوە. لە قۆناغەکانیتردا، ڕەخنە لەم تیۆرانە گیران، واتە بە بڕوای هەندێ کەس پێویستە پرسەکانی پەیوەست بە گەشەی سیاسی بە پێی فاکتەرە دەروونی و دەرەکییەکان بخوێندرێتەوە بۆیە ناکرێت تەنیا جەخت لەسەر ڕەهەندە دەرەکییەکەی بکرێتەوە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بە پێودانگ و بگۆڕگەلی جۆراوجۆر بکەین کە بەدرێژایی چوار دەیە ڕابردوو سەبارەت بەگەشەی سیاسی جەختیان لێکراوە و بە پێی ئەم پێودانگانە لێکدانەوەی گەشەسەندنی سیاسی کراوە.

١. ساموێل هانتینگتۆن : بە بڕوای هانتینگۆن هەر ئەندازە سیستەمی سیاسی لە سادەییەوە بەرەو ئالۆزی، لە وابەستەیی (التبعیة) بەرەو سەربەخۆیی، لە نامەیلدارییەوە بۆ مەیلدار بوون (انعطاف)، لە پەرت و بڵاوییەوە بۆ یەکگرتوویی مەیلدار بێت، بەهەمان ئەندازە، ئاستی گەشەسەندنی سیاسی ئەم سیستەمە بەرز دەبێتەوە. بەم جۆرە بە بۆچوونی ئەم بیرمەندە پێوەرەکانی گەشەسەندنی سیاسی بریتین لە : ئالۆزی، سەربەخۆیی، مەیلداری، یەکگرتوویی و پراگماتیزم.

٢.  سامۆیل هانتینگتۆن و نلسۆن : ئەم دوو توێژەرە یەکێك لە پێودانگە سەرەکییەکانی گەشەی سیاسی، بەشداری کردنی سیاسی دەزانن و سیستەمەکان بە پێی ئەم پێودانگە پۆلیندەکەن. مۆدیلی ئەم دوو توێژەرە بریتین لە :

أ.  مۆدیلی بۆرژوازیی گەشەسەندن : لەم مۆدیلەدا تەنیا پێداویستییە سیاسییەکانی چینی تازە سەرهەڵداوی مامناوەندی، لە چوارچێوەی پەرەپێدان بە دامەزراوەکانی هەڵبژاردن و یاسادانان،رەچاو دەکرێت.

ب.  مۆدیلی پۆپۆلیستی : لەم مۆدیلەدا زۆرتر جەخت لەسەر بەشداری و مۆبیلیزە کردنی سیاسی و یەکسانی ئابووری، سەرەڕای نزم بوونی ڕێژەی بووژانەوەی ئابووری، دەکرێتەوە.

ج.  مۆدیلی لیبراڵ: لەم مۆدیلەدا نۆیگەریی و گەشەسەندن دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی بارودۆخی ماددی و پرسگەلێك دەورووژێنێت. بەڵام سیستەم هەوڵدەدات گرفتە هەڵقولاوەکانی ئەم پرۆسەیە چارەسەر بکات.

د.  مۆدیلی خۆکامە: لەم مۆدیلەدا دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریی چینە خوارووەکانی کۆمەڵگا و سەرکوتکردنی بەشداری چینی مامناوەندیی بەکار دەهێنرێت.

ه.  مۆدیلی تکنۆکرانیکی گەشەسەندن : لە خەسڵەتەکانی ئەم مۆدیلە نزمی ئاستی بە شداری کردنە و زۆرتر جەخت لە سەر گەشەی ئابووری دەکاتەوە.

ئەم دوو توێژەرە هەوڵدەدەن لە چوارچێوەی دوو جۆری گەشەسەندندا خوێندنەوەی ئەم مۆدیلانە بکەن، یەکەمیان بارودۆخێکە، کە چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا هەوڵی گەیشتن بە دەسەڵات و بەشداریکردنی سیاسی دەدەن، ئەوەی تریشیان بارودۆخێکە کەتیایدا گەشەی ئابووری دەبێتە هۆی دروستکردنی نایەکسانی ئابووری. بە گشتی ئەم دوو توێژەرە هەوڵیاندا، پەیوەندی نێوان بەرفراوانی  وسنووردداربوونی بەشداریی سیاسی و ئاستی یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابووری نیشانبدەن.



بە گشتی هانتینگتون بە پێی ئاستی بە پیشەسازیی بوون، بزاڤ و مۆبیلیزەکردنی کۆمەڵایەتی , بووژانەوەی ئابووری و بەشداریی سیاسی، چەمکی گەشەسەندنی سیاسی هەڵدەسەنگاند. بە بڕوای ئەو چونکە لە پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسیدا داواکاریی نوێ بۆ بەشداریکردن و گێڕانی ڕۆڵی نوێتر سەرهەڵدەدەن، بۆیە پێویستە سیستەمی سیاسی بۆ گۆڕینی بارودۆخ توانایی و لێهاتوویی پێویستی هەبێت. بە پێچەوانەوە سیستەم ڕووبەڕووی ناسەقامگیری، پشێوی، دەسەڵاتخوازی و هەرەس هێنانی سیاسی دەبێتەوە و لەوانەیە بەرپەرچدانەوەی کۆمەڵگا بۆ ئەم پشێوییە خۆی لە شۆڕشدا ببێنێتەوە.

٣. لۆسیان پای: پای ئاماژەی بە پێوەر و بگۆڕێکی تایبەت  و دەستنیشانکراو لە گەشەی سیاسیدا نەکردووە و جەخت لەسەر چەمکگەلی جۆراوجۆر دەکاتەوە. کە دەتوانین بەم شێوەی خوارەوە روونیان بکەینەوە.

گەشەی ئابووری پێش مەرجی گەشەی سیاسی، گەشەی سیاسی بەردەوام و وەرچەرخانی ڕێکخراو، پێداویستی گەشەی سیاسی،گەشەسەندن کارگێڕی و یاساییە، گەشەی سیاسی بە پێی بەهێزکردنی بەها و نەریتە دیموکراتییەکان، گەشەی سیاسی هاوتەریبی نوێگەریی  سیاسی، مۆبیلیزە کردنی جەماوەر و بەشداریکردن پێداویستی گەشەسەندنی سیاسییە، دەبێ بە پێی سیاسەتی کۆمەڵگا پیشەسازییەکانی ڕۆژئاوا خوێندنەوەی گەشەسەندنی سیاسی بکرێت و  لە کۆتاییشدا گەشەسەندنی سیاسی بە تواناکردنی  (تجهیز) دەسەڵاتی سیاسییە.

بە گشتی پای بەرزبوونەوەی توانایی سیستەم بۆ وەڵامدانەوەی پێداویستی و داواکارییەکانی کۆمەڵگا، فرە ستراکتۆریی، بە پسپۆڕیی بوونی ستراکتۆرەکان و بەرز بوونەوەی بەشداریی سیاسی، لە پێداویستییەکانی گەشەسەندنی سیاسی هەژمار دەکات. بە بڕوای پای بۆ بەدیهێنانی گەشەسەندنی خوازراو (مطلوب) پێویستە سیستەمی سیاسی بە سەرکەوتوویی لە زنجیرە قەیرانێك دەرباز بێت. پای ڕەچاوی پێشخستن و دواخستنی یەکێك لە قەیرانەکان ناکات. چونکە هەلومەرجی

کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵگاکان بۆ رووبەڕوو بوونەوەی هەریەك لەم قەیرانانە جیاوازە.

بە پێی شیکردنەوەی پای قەیرانی شوناس پەیوەندی بە کولتووری نوخبەکان و کۆمەڵانی خەڵك سەبارەت بە هەستی نیشتیمان پەروەرییەوە هەیە و هێدی هێدی ناکۆکی لە نێوان وەفادارێتی نەژادی و پابەندی نیشتیمانی زۆرتر دەکات و گرفتگەلێك بۆ یەکگرتوویی و یەکپارچەیی وڵات دروستدەکات. قەیرانی مەشروعییەت بە هۆی ناکۆکی لەسەر سەرکردایەتی کردن و سەرچاوەی دەسەڵات روو دەدات، بۆ نموونە تاقمی دەسەڵاتدار ناچار بە رکابەرێتی کردنی تاقمێکیتر دەبێتەوە. لەم رێڕەوەدا دەسەڵاتی تاقمێك لە لایەن خەڵکەوە رەتدەکرێتەوە یاخود بە ناڕەوا هەژمار دەکرێت قەیرانی بەشداری کردن زنجیرە ناکۆکییەکی بە دواوە دێت کە لەم رێڕەوەدا نوخبەی دەسەڵاتدار، داواکاری و هەڵسوکەوتی ئەو کەس و گرووپانەی کە هەوڵی بەشداریکردن لە سیستەمی سیاسیدا دەدەن بە نایاسایی و نارەوا هەژمار دەکەن. قەیرانی دەستڕۆیی (نفوز) لەمیانەی گوشار خستنەسەر نوخبەی دەسەڵاتدار بۆ رێکخستنەوەی دامەزراوەکان و هێنانەدی نوێگەریی و ئەفراندن سەر هەڵدەدات.

دواجار قەیرانی دابەشکردن لە چوارچێوەی پرسگەی ئایدیۆلۆژیکی، سەرچاوە فیزیکی و مرۆییەکان بەرجەستە دەبێتەوە.

٤. گابریل ئالموند: ئالموند و پاول لەڕووی هەڵسوکەوتەوە (سلوك) بەرژەوەندیی خوازیی، لە سەرووتر بوونی چالاکی کۆمەڵی لەسەر تاکگەرایی هاوبەندیی و وەفادارێتی بەسیستەم، پەیوەندیی سیاسی پشتبەستراو بە متمانەی دوو لایەنە، بە پێوەرەگەلی گەشەسەندنی سیاسی هەژمار دەکەن و لەڕووی ستراکتۆرییەوە جەخت لەسەر فرەستراکتۆریی، کولتووریی دونیاخوازیی، ئاستێکی بەرزی سەربەخۆیی سیستەمە لاوەکییەکان ( ) دەکەنەوە.

لە لایەکیترەوە، گابریل ئالموند و سیلانی ڤێربای لە توێژینەوەکانیاندا لەسەر پێنج وڵاتی بەریتانیا، ئەلمانیا، ئەمریکا، ئیتاڵیا و مەکزیك بەم ئەنجامە دەگەن کە هۆی

سەرەکی گەشە نەکردنی وڵاتانی جیهانی سێیەم دەگەڕێتەوە بۆ فاکتەری دەروونی، مێژوویی و کولتووریی ئەم وڵاتانە. واتە بە درێژایی مێژوو لەم سیستەمانەدا جۆرە کولتوورێك دروستبوو. کە لەمپەرە لەبەردەم گەشەسەندنی سیاسیدا. بە بڕوای ئەم دوو کەسە دەکرێ لە ڕێگەی بەکارهێنانی میکانیزمی وەك بەرزکردنی ئاستی خوێندەواریی، سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سامان، بەرەبەرە ئاسەوارە خراپەکانی دەروونی و مێژوویی لەبەین تاکەکان بۆ لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی و گێڕانی ڕۆڵی سیاسی نوێ و بەشداریکردن لە پرۆسەی بڕیارداندا ئامادە بکرێن. بەم شێوەیەش ئالموند هەوڵدەدات کە بە جۆرێك، سیستەمی ئۆرتۆدۆکس و تیۆرەکانی پەیوەست بە کولتوور بە گەشەسەندنی سیاسییەوە گرێبدات.

لەم ئاراستەیەدا کولتووری سیاسی لە زنجیرە بنەما، بڕوا و ڕەگەز پێکهاتووە کە مانا بە سیستەمی سیاسی دەدات و ڕەفتارگەلی سیاسی تایبەتی لێدەکەوێتەوە. هەڵبەت لە خوێندنەوەی بنەما (مقومات) جۆراوجۆرەکاندا، سیستەمە جۆراوجۆرەکان خاوەن بارودۆخی جیاوازن. بۆ نموونە ئەگەرچی لە مەکزیك بە هۆی سیمبولە بزوێنەرەکانی شۆڕش تا هەنوکەش وەفادارییان بۆ سیستەمی سیاسی هەیە. بە پێی ئەم ڕێسایانە ئالموند و ڤێربای سێ جۆرە کولتووری سیاسی دەستنیشان دەکەن کە بریتین لە: کولتووری سنووردار، پەیڕەوکەر (التبعي) و کولتووریی بە شداریکردن. لە کولتووری سنووردار‌دا تاك بە دەگمەن گیرۆدەی کاروباری سیاسی دەبێت و لێی ئاگادار نییە. لە کولتووری پەیڕەکەردا تاکەکان پەیوەندیی هەڵچوو (انفعالي) و ملکەچانەیان هەیە. بەڵام لە کولتووری بەشداریکردندا تاکەکان بە پۆزەتیفانە سەبارەت بە زۆربەی لایەنەکانی سیستەمی سیاسی، پارتە سیاسییەکان، بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکان و دەنگداندا، مۆبیلیرە دەکرێن. ئالموند و ڤێربای خوێندنەوەی تێکەڵێك لە کولتوورە سیاسییەکانی وەك سنووردارە — پەیڕەویکەر، بەشداریی — سنووردار، بەشداریی — پەیڕەویکەریان کردووە.



بەڵگەنەویستە کە لە دیارکردنی کولتووری سیاسی و کولتوورێك کە بە چەشنێك بتوانێت یارمەتی گەشەسەندنی سیاسی بدات فاکتەری جۆراوجۆری وەك هەل و مەرجی مێژوویی، جوگرافی، ستراکتۆریی ئابووری، کۆمەڵگایی بوونی (التنشئة) سیاسی کاریگەرییان هەیە و لەم کاریگەرییەش لە کۆمەڵگاکاندا جیاوازە.

ئالموند و جمێرکولمەن گەشەسەندنی سیاسی بە پرۆسەیەك دەزانن کە تیایدا سیستەمە کلاسیکییەکانی نارۆژئاوایی خەسڵەتی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان وەردەگرن. بە بۆچوونی ئەم دوو کەسە ئەم خەسڵەتانە بریتین لە: ڕێژەیەکی بەرزی شارنشینی، زۆری خوێندەواریی، داهاتی ساڵانە بەرز، جووڵانەوەی بەرفراونی جۆگرافیایی و کۆمەڵایەتی، ئاستێکی بەرزی بە پیشەسازی بوونی ئابووری، تۆڕی بەرفراوانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و بەگشتی بەشداریی بەرفراوانی ئەندامانی کۆمەڵگا لە چالاکییە سیاسی و ناسیاسییەکاندا.

٥-کارل دویچ: پێوەری سەرەکی لە لایەن دویچ بۆ گەشەسەندنی سیاسی ڕادەی جووڵانەوەی کۆمەڵایەتیدا (حراك اجتماعی). لە ڕوانگەی دویچەوە، جووڵانەوەی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکە کە تیایدا بڕوا و وابەستەییە تەقلیدییەکان لە بوارەکانی سیاسی، دەروونی، ئابووری، کولتووری و کومەڵایەتی دەگۆڕدرێن و جەماوەر بۆ قەبوولکردنی شێواز گەلی نوێی هەڵسوکەوت کردن ئامادە دەکات. بەم جۆرەش بابەتی گەشەسەندنی سیاسی لە پرسە کۆمەڵایەتییەکان جیاناکرێتەوە.

شایانی ڕوونکردنەوەیە کە هەر سیستەمێك لە پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسیدا ئازموونگەی تایبەت بە خۆی هەیە. چونکە ئەم پرۆسەیە بە سیستەمی ئابووری، سیاسی، کولتووری و فاکتەرە سروشتییەکانی هەر کۆمەڵگەیەك گرێدراوە و لە ژێر کاریگەری ئەم بگۆڕانەدا بنیات دەنرێت. بەڵگە نەویستە کە کۆی وەرچەرخان و گۆڕانکارییانە، لێك دروستدەکات و تەنیا سیستەمێکی کارامە دەتوانێت گرفتگەی لەم گۆڕانکارییانە بە دروستی هەڵدەسەنگێنێت و پەیوەندی نێوان ئەم بگۆڕانە لە پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسیدا دەستنیشان بکات. هەروەها نابێت گشت بەشەکانی





کۆمەڵگا بەیەك ئاست رووبەڕووی گۆڕان ببنەوە، واتە لەگەڵ پاراستنی هاوسەنگی و هەماهەنگی لە نێوان بگۆڕە جۆاروجۆرەکاندا پێویستە بە وردی توانایی هەر بە شێك هەڵبسەنگێندرێت، بۆ نموونە لە رەوتی سەر لە نوێ دابەشکردنەوەی دەسەڵات، لەوانەیە دەسەڵات بەخشین بە کەرتێك، ببێتە هۆی لاواز بوونی کەرتە کافتیرلا و لە ئەنجامدا سیستەمی سیاسی رووبەڕووی قەیرانگەلێك ببێتەوە، واتە لە بڕی ئەوەی کە ئەم کارانە لە پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسی و نوێگەریدا بەشداریکردنی زۆرتری لێ بکەوێتەوە، ببێتە لەمپەرێك بۆ مۆبیلیزە کردنی کۆمەڵایەتی، ئەم پرۆسەیەش وەکو دژی گەشەسەندن و بەشداریی کردن و قەیرانی مەشروعییەت بەرجەستە ببێتەوە.

٦- کاوانوف : کاوانوف شێوازی دارِشتنی یاسای بنەڕەتی و ئەو رێسایانەی کە بە پێی ئەم یاسایە دارێژراون و پێکهاتەی سیاسی دادەمەزرێنێت و کاریگەری بەسەر هەڵسوکەوتی تاك، گرووپ و رێکخراو دەنوێنێت، بە فاکتەری سەرەکی گەشەسەندن هەژمار دەکات. ئەو زۆر بایەخ بە فاکتەرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان ناکات.

٧- ئایزنسات : ئەو گەشەسەندنی سیاسی بە ستراکتۆری سیاسی فرە رەهەند (متنوع)، بە پسپۆڕی کراو، دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی بەسەر گشت بەش و پانتاکانی کۆمەڵگاوە گرێدەدات. لە کاتێکدا کە ماکس ڤێبر سێ جۆرە سیستەمی سیاسی دیار دەکات و لە میانەیاندا ئاماژە بەسیستەمی ((باوکانە))، ((باوك سالاری)) و ((فیودال)) دەکات. ئایزنستات ئاماژە بە سیستەمی ((ئیمپراتۆریی مێژوویی)) دەکات. ئەو هەوڵدەدات نیشانبدات کە چۆن ئەم سیستەمانە توانیویانە لە نێوان رەگەزە تەقلیدی و ناتەقلیدییەکان هاوسەنگی دروستبکەن و لە ژێر چ جۆرە هەلومەرجێکدا خەندێ لەم کۆمەڵگا بۆ رۆکراتییە مێژووییانە بۆ سیستەمی سیاسی مودێرن گۆڕدراون. بە بڕوای ئەو لە پرۆسەی مودێرنیزە بوونی کۆمەڵگادا، پێویستە رەچاوی چەند خاڵێك بکرێت کە بریتین لە :

١- ناسینی ناوەڕۆك و پێکهاتەی نوێگەراکان.

٢- شیکردنەوەی ئاستی نوێگەرایی لە نێوان چین و گرووپە بەرفراوانەکان.



٣- دیاریکردنی (جۆری) پەیوەندی نێوان نوخبە نوێگەراکان بە کۆمەڵگا و سیستەمی چینایەتییەوە.

٤- شیکردنەوەی کارکردی نوخبەکان لە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ حکوومەت و کۆمەڵگا. بە گشتی، کەسانی وەك ئایزنستات جەخت لەسەر فرەستراکتۆریی، پسپۆریی بوون (تخصص) و بۆرۆکراتیزە بوونی سیستەمی سیاسی دەکەنەوە. هاوکات لەگەڵ فرە ستراکتۆریی پێویستە رەچاوی ئاستی سەربەخۆیی یان وابەستەیی ستراکتۆر و کارکردەکانیش بکرێت. واتە هەر ئەندازە کۆمەڵگا خاوەن ستراکتۆرگەلێك بێت کە هەر یەکیان خاوەن شوناسی سەربەخۆ بێت، بەهەمان ئەندازە ئاستی گەشەی سیاسی کۆمەڵگا بەرز دەبێتەوە. بۆ نموونە لە سیستەمی تەقلیدی باوکسالارانەدا، سەرکردەکان ناتوانن بە باشی سوود لە سەرچاوە و تواناییەکان وەربگرن و توانایی کەمیان بۆ وەڵامدانەوەی داواکاری خەڵك هەیە. لەم بارەیەدا پێویستە بۆ گەشەسەندنی سیاسی گشت تواناییەکانی سیستەمی سیاسی رەچاو بکرێت. گرنگترین ئەم تواناییانە بریتین لە: دابەشکردنی، سیمبولی (رمزی)، هەڵێنجان، پێکهێنان، رێکخستن. لە خوێندنەوەی وەرچەرخانی چەمکی گەشەسەندنی سیاسی دەبینین کە هەر یەك لە توێژەران لە چوار دەیەی رابردوودا، جەخت لەسەر پێوەری تایبەت دەکەنەوە. بە چەشنێك کە زانایانی وەك روستۆ، بلاك، لیپست، مۆروپای بە سوود وەرگرتن لە توێژینەوە بەراوردکاریی- مێژووییەکان، سەرەڕای بەراوردی نێوان کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان پیوەرگەلی وەك کولتوور، دامەزراوە، سەرکردایەتی، ستراکتۆرە ئابوورییەکان و... رەچاویان کردووە و بەراوردی نێوان نموونە گەلی جۆراوجوریان کردووە بۆ نموونە ((برینگتون مۆر)) سە نموونەی نویگەریی واتە دیموکراسی رۆژئاوا، سیستەمی فاشیستی و سیستەمی کۆمۆنیستی و ئەزموونی وڵاتان، خوێندنەوەی شێوازە جۆراجۆرەکانی نوێگەری و گەشەسەندنی سیاسی کردووە. مۆر خوێندنەوەی بۆ بنەماکانی شۆڕشی دیموکراسی سەرمایەداری لە بەریتانیا، فەڕەنسا و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کرد و ئەزموونەکانی ئاسیای بۆ





ولاَتانی چین، ژاپۆن و هیند بە کار هێنا. دەتوانین ڕەخنەی زۆر ئاراستەی تیۆری مۆر بکەین، بەتایبەت ناتوانین بنەما کۆمەڵایەتییەکان بە پرەنیسیپێکی بەڵگە نەویست و ڕێگەیەك بەرەو جیهانی مودێرن هەژمار بکەین و دەبێ گشت ولاَیەتەکانی ڕۆڵە سیاسی-ستراتیژییەکان لە شۆڕشە نوێخوازەکاندا بە بۆرژواز یا خود پرولتاریا بسپێردرێت.

گرووپێکیتر لە توێژەرانی زانستە سیاسییەکان وەك تانتر، دویچ و لرنێر جەخت لەسەر خوێندنەوەی پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان دەکەنەوە. لەم جۆرە توێژینەوانەدا. توێژەران هەوڵی دۆزینەوەی هۆ و هۆبەند (علە و معلول) دەدەن و بە خوێندنەوەی ڕەفتارییانەی (السلوكية) گۆڕین و وەرچەرخان، گەشەسەندنی سیاسی شیدەکەنەوە. لێرەدا پرسی وابەستەیی سیاسەت بە پرسە کۆمەڵایەتییەکان لە ئارا دایە و پەیوەندی نێوان بگۆڕە جۆراوجۆرەکان هەڵدەسەنگێندرێت. ئەم دەستە لە زانایان لەو بڕوایەدان کە هەرجۆرە گۆڕانێك لە بەشێکی کۆمەڵگا وەك شەپۆلێك بەسەر گشت بەشەکانیتردا پەرەدەسێنێت و پێویستە ڕادەی ئەم گۆڕان و کاریگەرییە خوێندنەوەی بۆ بکرێت.

دواجار کەسانێك وەك ئالموند، لوی، ئەپیرو بایندر گەشەسەندنی سیاسی لە ڕێگەی سیستەم، کارکردی دەزانن. ئەم دەستە هەوڵدەدەن کە سیاسەتی بەراوردکاری بە پێی نوێگەری و وەرچەرخانی سیاسی لە چوارچێوەی سیستەمی- کارکردی خوێندنەوەی بۆ بکەن بۆ نموونە، ئالموند کارکردەکانی سیستەمی سیاسی وەك پەیوەندییە سیاسییەکان، بەکۆمەڵگایی بوونی سیاسی، هەڵبژاردنی (خیارات) سیاسی و گردبوونەوە و دەربڕینی خواست و بەرژەوەندییەکان بە مودە خیلافی (INPUT) سیستەم هەژمار دەکات و یاسادانان، جێبەجێ کردنی یاساکان و دادوەری سیاسی بە موخریجاتی (OUTPUT) هەژمار دەکات و شیدەکاتەوە. لەم ڕێڕەوەدا ئەم خوێندنەوەیە جەخت لەسەر هاوسەنگی سیستەم دەکاتەوە و ئەمەش لەکاتی گۆڕان و وەرچەرخان لە پرۆسەی گەشەسەندن و نوێگەری سیاسیدا، ناکۆکی و دژیەك بوونگەلێك دروستدەکات. بەواتایەکیتر ئەوانەی کە بۆ خوێندنەوەی



گەشەسەندن و نوێگەری سیاسی سوود لە شیکردنەوەی سیستەمی و کارکردی وەردەگرن، لە لایەکەوە بە ڕوانگەیەکی پارێزگارانە دەڕواننە پاراستنی هاوسەنگی سیستەم و لەلایەکیترەوە خوازیاری گۆڕان و وەرچەرخان تا ئاست وەچانێکی قووڵ و ریشەن. لە ڕێڕەوی گۆڕانکارییەکان کە بە درێژایی چوار دەیەی ڕابردوو بەسەر چەمکی گەشەسەندنی سیاسیدا ڕوویداوە- بەتایبەتیش لە ساڵانی دوای شەڕی دووەمی جیهانی و بە تایبەتیش لە ساڵانی ١٩٥٠- زۆرتر جەخت لەسەر پێوەرە چەندایەتییەکانی (کمی) ئابووری دەکرا، لە ڕاستیدا گەشەسەندن هاوواتای گەشەسەندنی ئابووری هەژمار دەکرا. بەرەبەرە پێودانگە کومەڵایەتی و سیاسییەکان جێگرەوەی پێودانگەکانی پێشوو بوونەوە. هەروەها کەشتی زاڵی شەڕی سارد بەسەر توێژینەوەکانی پەیوەست بە گەشەسەندن، بووبە هۆی ئەو کەبە ئایدیۆلۆژیکانە مامەڵە لەگەڵ بابەتی گەشەسەندن بکرێت و بەرەبەرە لایەنە پراگماتیزم و نابەهاییەکان جێگەیان گرتەوە.

وەرچەرخانێکیتر لە چەمکی گەشەسەندنی سیاسیدا جێگیر بوونی ڕێبازە لیبرالیستییەکان لە بری مامەڵە پارێزگارانە لەگەڵ ئەم بابەتەدا بوو بە چەشنێك کە توێژەران بەم ئەنجامە گەیشتن کە لە پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسیدا پێویستە ڕەچاوی وەرچەرخان و گۆڕانکارییەکان بکرێت، چونکە بە پێچەوانەوە گەشەسەندنی سیاسی مانا و ناوەڕۆکی نامێنێت.

لە کاتێکدا کە توێژەران هەوڵیاندەدا سیاسەت وابەستەی ئابووری بکەن بەڵام لە قۆناغەکانی دواتردا پەیوەندی نێوان پێودانگە ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان ڕەچاوکران، بەبێ ئەوەی کە ئەم پێودانگانە لە بگۆڕەکانی سەربەخۆ و پەیڕەو (مستقل و تابع) پۆلین بکەنەوە.

وەرچەرخانێکیتر لە شێوازی مامەڵە کردن لەگەڵ چەمکی گەشەسەندنی سیاسی، پەیڕەوی کردنی ڕێبازی مێژوویی و کامڵبوونی (تکامل) لەبری توێژینەوە نامێژووییەکان بوو. چونکە لەلایەکەوە بۆ گەشەسەندنی سیاسی جیهانی سێیەم





توێژەران نموونەی ڕۆژئاوایان پێشکەشدەکرد، لەلایەکیترەوە گۆڕانکارییە مێژوویی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژئاوا کە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم ڕوویان نەدابوو پشتگوێ دەخست. لەوانەیە وەرچەرخانە ریشەییەکانی کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەم دەیانتوانی بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەم ناکۆکییە چارەسەربکەن.

لە کاتێکدا کە جەخت لەسەر شارنشینی، پەرەپێدانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن دەکرایەوە، بەڵام بەرەبەرە پرسگەلی وەك سەرکردایەتی، بنیاتنانی دامەزراوەکان و ستراکتۆری سیاسی ئەولەویەتیان بەدەستهێنا. ئەگەرچی مامەڵە کردنە سەرەتاییەکان لەگەڵ چەمکی گەشەسەندنی سیاسی ڕوانگەیەکی وەستاوی هەبوو، بەڵام لە دەیەکانی دواتردا گۆڕان و وەرچەرخان بوو بە تەوەری سەرەکی لە خوێندنەوەی گەشەسەندنی سیاسیدا.

تیۆرییە ئۆرتۆدۆکسییەکانی گەشەسەندنی سیاسی کە نزیك بە تیۆرگەلی کاملبوونی گەشەسەندن، مایکرۆ کۆمەڵناسی، مۆدێرنیزاسیۆن و ڕوونکردنەوە و دەروونناسییەکان بوون، لە دەیەی ١٩٧٠دا ڕەخنەی لێگیرا و توێژەران هەوڵیاندا لە ڕەهەندی وابەستەبوون و سەربەخۆییەوە گەشەسەندنی سیاسی شرۆڤە بکەن. لەم ڕەوتەدا زۆرتر جەخت لەسەر ڕەهەندی دەرەکی گەشەسەندن دەکرا. چونکە بە بۆچوونی هەندێ لە زانایان لە قۆناغی یەکەمدا، ڕێڕەوی گەشەسەندن لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا وەکو یەك بوو بەڵام بە هاتنی کۆلۆنیال بۆ جیهانی سێیەم ئەم ڕەوتە پچڕا و ئەم کۆمەڵگایانە نەیانتوانی بچنە ناو قۆناغی دوای فیودالیزمەوە.

لەقۆناغەکانیتردا ئەم جۆرە مامەڵە کردنە لەگەڵ بابەتی گەشەسەندنی سیاسی و ئابووری ڕەخنەی لێگیرا و هەر دوو ڕەهەندی ناوەوە و دەرەوەی گەشەسەندن گرنگی پێدرا.

ئەگەرچی بە درێژایی چوار دەیەی ڕابردوو زانایانی زانستە سیاسییەکان لە ڕەهەندی جۆراوجۆرەوە خوێندنەوەیان بۆ گەشەسەندنی سیاسی کردووە و جەختیان لەسەر بگۆڕگەلی جۆراجۆر کردووەتەوە، بەڵام لەسەر زۆرێك لەم بگۆڕانە کۆدەنگیان



هەیە. هۆی سەرەکی ناگشتاندنی تیۆرییەکانی گەشەسەندنی سیاسی بەسەر گشت کۆمەڵگاکاندا، دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکرێتەوە:

یەکەم: بە پێچەوانەی پێوەرەکانی گەشەسەندن و دواکەوتنی ئابووری کە لە ڕێگەی چەندایەتییەوە (کمی) دیار دەکرێن و بە پێی هێماکانی (مؤشرات) وەك بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی، داهاتی ساڵانە، بەرز بوونەوە و دابەزینی توانای کڕین، دەکرێ لە چوارچێوەی ئامار و لێکدانەوەی وردەوە ڕێژەی گەشەسەندن و دواکەوتوویی بەڵام سەبارەت بەگەشەسەندن و دواکەوتوویی سیاسی توێژەر ناتوانێت ئەم کارانە ئەنجامبدات، چونکە ڕەگەز چۆنێتییەکانی گەشەسەندنی سیاسی بۆ پێوەری چەندایەتی ناگۆڕدرێت و هەر بۆیەش ناتوانین بەوردی پێودانگەکانی گەشەسەندن و دواکەوتوویی سیاسی هەڵبسەنگێنین. بۆ نموونە چۆن دەکرێت ئاستی بە کۆمەڵگایی بوون یاخود مەشروعییەتی سیاسی و بەدامەزراوەیی بوون لە کۆمەڵگایەکدا بپێورێت و لەم ڕێگەیەشەوە هەڵسەنگاندنی ئاستی دواکەوتوویی و گەشەسەندنی سیاسی بکرێت؟ لێرەدا بابەتی زۆرگرنگی بوونی بگۆڕگەلی لەرادەبەدەر زۆر پەیوەندی ئاڵۆزی نێوان ئەم بگۆڕانەیە، بە چەشنێك کە ناتوانین لە ڕێگەی پەیوەندی نێوان ئەم بگۆڕانەوە، پەیوەندی نێوان هۆ و هۆبەند (علە و معلول) دیاریبکەین بۆ نموونە ئەگەری ئەو هەیە کە وەها بەڵگاندن بکەن کە خودی مەشروعییەتی سیاسی دەتوانێت ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی بەشداریی کردن لە کۆمەڵگادا، لە کاتێکدا کە خودی بەشداری سیاسی و کۆمەڵایەتیش یارمەتی گەشەسەندنی سیاسی و مەشروعییەتی سیاسی دەدات. خودی ئەمەش دوو بابەتی دەسەڵات و بەها لە خۆ دەگرێ و لە ڕێگەی ئەم دوو بابەتەوە، مەشروعییەت بەرجەستە دەبێت. چونکە هەر سیستەمی وەك تۆرێکی بەهاکان کاردەکات و لەمیانەیدا هێز بە بەها گرێدەدات و ئەگەر ئەم جۆرە پەیوەندییە لە نێوان دەسەڵات و سیستەمی بەها دروستبێت ئەوکات ((دەسەڵات)) دەستەبەر کراوە. فاکتەرێك کە ئەم لێك نزیك بوونە لە نێوان بەها و هێز دروستدەکات بە مەشروعییەت ناو دەبردرێت. بەم جۆرەش دەسەڵات بە





مەشروعییەت گرێ دراوە و مەشروعییەتیش بە هاوبەش بوونی لە بەهاکاندا دەخرێتەڕوو. لە راستیدا ئەم بابەتە پەیوەستە بە پێناسەکردنی سیاسەت کە تیایدا سیاسەت بریتییە لە : دابەشکردنی دەسەڵات ئاسایانەی بەهاکان (توزیع السطویی للقیم).

بەخستنەڕووی گرفتی یەکەم بە پرسی دواتر دەگەین واتە بە مامەڵە کردنی بەهاییانە لەگەڵ ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی گەشەسەندنی سیاسی، ئەم هەڵسەنگاندنە بە سەختی ئەنجامدەدرێت. ئەمڕۆکە سەبارەت بە زۆرێك لە پێودانگە سەرەکییەکانی گەشەسەندنی سیاسی وەك مەشروعییەت و بەشداریی سیاسی، لە نێوان توێژەرانی زانستە رامیارییەکاندا، کۆدەنگییەك هەیە، بەڵام هەرکە ئەم ڕەگەزانە سەبارەت بە کۆمەڵگا، کولتوور، ستراکتۆرە جۆراوجۆرەکانی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان خوێندنەوەیان بۆ دەکرێت، ناتوانین بەپێی ئەم پێودانگانەوە کۆمەڵگایەك لە رووی سیاسییەوە گەشەسەندووە و سیستەمێکیتر بە دواکەوتوو هەژمار بکەن. لە کۆتاییدا خستنەڕووی ئەم خاڵە گرنگە کە سەرەڕای ئەوەی کە تێوردارێژەرە سەرەتاییەکانی گەشەسەندنی سیاسی لە ژێر بارودۆخی شەڕی ساردا تیۆرگەلێکیان پێشکەشکرد، بەڵام بە تێپەڕ بوونی کات پرسی گەشەسەندنی سیاسی وەك پرەنسیپ و واقییەتێك بوو بە چەقی توێژینەوەی توێژەران و زانایانی زانستە رامیارییەکان جا لە رۆژئاوا بێت یا خۆد لە جیهانی سێیەمدا. بە هۆی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە سیستەمی نێودەولەتیدا روویانداوە، چاوەڕوان دەکرێت کە توێژەران بەبێ ڕەچاوکردنی بۆچوونی ئایدیۆلۆژیکی و بلۆکگەرایی، بابەتی گەشەسەندنی سیاسی، بە پێی پێداویستییە راستەقینەکانی کۆمەڵگاکانەوە شیبکەنەوە.



# بەشی دووەم

# گەشەسەندنی تیۆری گەشەسەندنی سیاسی

## پێشەکی:

تایبەتمەندی ستراکتۆریی و فرەکولتووری کۆمەڵگا گەشەسەندووەکان بووە هۆی ئەوەی کە نەتوانێت لە چوارچێوەی تیۆری یا خود ڕێبازێك وێنەیەکی ڕوون لە گەشەسەندنی ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە پێشکەشبکرێت. ناوەڕۆکی بەهادار و نۆرماتیڤانەی پێودانگەکانی گەشەسەندنی سیاسی (بەپێچەوانەی گەشەسەندنی ئابووری)، هەروەها کەشی ئایدیۆلۆژیکی زاڵ بەسەر توێژینەوەکان لە سەردەمی شەڕی سارددا، هۆکار بوون بۆ ئەوەی کە نەتوانرێت واقیعییەتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا گەشەسەندووەکان بەبێ لایەنە خوێندنەوەیان بۆ بکرێت. لە کاتێکدا کە سەرەتا وەها وێنا دەکرا کە پرسی وڵاتانی باشوور زۆرتر ئابوورین، بەڵام تێپەڕ بوونی کات نیشانیدا کە گەشەسەندنی ستراکتۆرەکان و نەبوونی دامەزراوەی کارامە و وەڵامدەرەوە و خودگەرایی لە فاکتەرە سەرەکییەکانی دواکەوتوویی ئەم کۆمەڵگایانە هەژمار دەکرێن. لە توێژینەوە هەنۆکەییەکاندا هەوڵدەدرێت لە بری دابەشکردنی فاکتەرەکان بەسەر نێوخۆیی و دەرەکیدا، هەڵسوکەوتی خێزانەکان، چین، بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان، حکوومەت، کۆمپانیا و ڕێکخراوە ناحکوومییەکان بەپێی ڕوانگەیەکی گشتگیرانە لە گەشەسەندن خوێندنەوەیان بۆ بکرێت.

### قەیرانی بە ئابووری بوونی گەشەسەندنی سیاسی:

لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا توێژینەوەکانی گەشەسەندن ڕووبەڕووی قەیرانی جیدی بووەتەوە. چونکە زۆرێك لە ڕێبازەکان وەك نوێگەریی، وابەستەیی و تیۆری سیستەمی جیهانی نەیانتوانیوە نموونەکانی گۆڕان و وەستان (ركود) لە کۆمەڵگا گەشەنەسەندووەکاندا ڕوونبکەنەوە.

پێشتر پرسەکانی گەشەسەندنی سیاسی لە ڕەهەندی ئابوورییەوە خوێندنەوەیان بۆ دەکرا و لەم ئاراستەیەدا بۆ خوێندنەوەی پاسۆلۆژییانەی بارودۆخی کۆمەڵگاکانی کەمتر گەشەسەندوو و پێودانگی وەك ڕێژەی سەرمایەگوزاریی، توانایی کڕین،

بەرهەمی ناپوختەی نیشتمانی، داهاتی ساڵانە، ڕێژەی کارکردن و بێکاری، سوودیان وەردەگرت. لەو ڕووەوە کە ئابووریناسان وەك بوارێکی زانستی مامەڵەیان لەگەڵ ئەم بوارەدا دەکرد، بۆیە یاساکانی ئەم بوارەیان وەك یاسای گشتگیر وێنا دەکرد کە بۆ هەر هەلومەرجێکی کاتی و شوێنی گونجاو بوو. هەر بۆیەش سەرەتا زۆربەی تیۆرییەکانی گەشەسەندن بریتی بوون لە تیۆرییەکانی بووژانەوە و وەرچەرخانی ئابووری، بەبێ ئەوەی کە ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ڕەچاو بکرێت. بەپێی ئەم چەشنە بارودۆخە، سروشتی بوو کە زۆرترین ستراتیژییەکانی گەشەسەندن بە ئاراستەی ئابووری بێت. بەم جۆرەش لەم جۆرە توێژینەوانەدا لایەنە سیاسی و کولتوورییەکانی گەشەسەندن ڕەچاونەدەکران، یان بە دەگمەن گرنگییان پێدەدرا. لەم چەشنە بارودۆخەدا. بێگومان توێژەران ئاسەوار و بەدواهاتەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەڵقولاّ و لە قەیرانە ئابوورییەکان یا خود بە دواهاتەکانی گەشەی خێرای ئابووری لەم کۆمەڵگایانەدا، گرنگی پێنەدەدەن.

بەڵام ناکرێ ئەم بابەتە پشتگوێ بخرێ کە لە دەسپێکی ساڵانی ١٩٥٠وە تیۆرگەلێك لە ئارادابوون کە بە کولتوور و سیاسەتەوە پەیوەندییان هەبوو، بەڵام کاتێك کە ئەم تیۆرانە لە پانتای شیکردنەوەی ئابووریدا بە کار دەهاتن ڕووبەڕووی ناکارامەیی دەبوونەوە و سەرەڕای پەراوێزخستنیان نەیانتوانی وێنایەکی تەواو و ڕاستەقینەی گەشەسەندن بخەنەڕوو.

زۆربەی ئەو ستراتیژییانەی کە پشت بەستراو بە تیۆرییە ئابوورییەکان بوون و لە لایەن سندووقی نێودەوڵەتی دراو، بانکی جیهانی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە بە وڵاتانی جیهانی سێیەم پێشنیار دەکرا گرنگی بە تایبەتمەندییە سیاسی و کولتوورییەکانی نەدەدا. لە چوارچێوەی ئەم ڕاسپاردانەدا گرنگی ئەوتۆ بە پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا و پێش مەرجەکانی چاکسازیی ئابووری نەدەدرا. لەم ئاراستەیەدا توانایی دامەزراوە سیاسییەکان و ڕێکخراوە کارگێڕییەکان و ئیرادەی سیاسی کە بتوانێت ئەم ستراتیژییانە جێبەجێ بکات، ڕەچاو نەدەکرا.



ئەم جۆرە ڕەچاو نەکردنە فاکتەرە نائابوورییەکان (سیاسی و کۆمەڵایەتی) لە زۆربەی ستراتیژییەکانی کاربەدەستانی کۆمەڵگاکانی لە دۆخی گەشەسەندندا، لە چوارچێوەی پلانی پێنج ساڵەی گەشەسەندنی دەبینرا، بە چەشنێك کە لەم پلانانەدا بایەخ بە ستراتیژی، ئامانج و پێودانگە (مؤشر) سیاسییەکان نەدەدرا. بە بۆچوونی بەرپرسان، بە گەیشتن بە ئاستێك لە بووژانەوە و گەشەی ئابوریی، خۆبەخۆ گرفتی گەشەسەندنی سیاسی و کۆمەڵایەتی چارەسەر دەکرێت.

بەم چەشنە جەخت کردنەوەی زۆربەی تیۆرەکان بەسەر لایەنی گەشەنەسەندنی ئابووریی دەبووە هۆی ئەوەی کە زۆرتر پشت بە نەهێشتنی هەژاری و دابینکردنی پێداویستییە مادییەکانی کۆمەڵگا گەشەنەسەندووەکان ببەسترێت و ئەم کارەش لە میانەی هێنانەدی بووژانەوەی ئابووریی و پرۆسەکانی گۆڕانکاریی کردن، وەك گەرەنتی گەشەی کۆمەڵایەتی هەژمار بکرێت. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە لە کۆمەڵگا گەشەسەندووەکاندا (بە لانیکەمەوە تا کۆتاییەکانی ١٩٦٠) فاکتەرە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان گرفت بۆ پێشکەوتنی ئابووریی دروستنەکەن و لە ئەنجامیشدا لە ئارادا بوونی کەشێکی خۆشبینانە ئەم بۆچوونە بەهێز ببووکە وەرچەرخانی ئابووری دەتوانێت ئاستێکی باشتری ژیان فەراهەم بکات ئەم جۆرە بۆچوونە لە گەشەسەندنی بوو بە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە توێژەران دان بەوە بنێن کە وڵاتانی هەژار دەیانتوانی سوود لە ئەزموونە بەنرخەکانی کۆمەڵگا گەشەسەندووەکان وەربگرن.

شکستەکانی هەڵقولاّو لە تەنیا جەختکردنەوە لەسەر فاکتەرە ئابوورییەکان بوو بە هۆی ئەوەی کە هێدی هێدی ڕوانگەکان بەرەو پرسە سیاسی و کولتوورییەکان بسوڕێنەوە و لە توێژینەوەکاندا، داتا، بۆچوون و تیۆری زانستەکانیتریش بەکار بهێنرێن. بەم جۆرەش دەرکەوت کە گرفتی وڵاتانی جیهانی سێیەم تەنیا ئابووری نین، بەڵکو لە زۆرێك بابەتدا هۆکانی گەشەنەسەندن بۆ فاکتەرە سیاسی و کولتوورییەکان دەگرێتەوە.





پێویستە ئاماژە بدەین کە لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم زۆربەی توێژینەوەکان لەسەر ئەم بابەتە بوون کە بە گشتی، مایکرۆ تیۆرییەکانی مارکیزم و لیبڕالیزم نەیانتوانیوە روونکردنەوەی پێویست بۆ جۆرەجیاوازەکانی گەشەسەندن و گەشەنەسەندنی وڵاتانی باشوور پێشکەش بکەن و نەیانتوانیوە پێشبینی دروستی رێڕەوی گەشەسەندنی ئەم وڵاتانە بکەن. سروشتییە کە ئەو ستراتیژییانەی کە بە پێی ئەم تیۆر و (مارکسیزم و لیبڕالیزم) و رێبازانە دادەڕێژرێن. ناتوانن ئامانجی ویستراو دەستەبەر بکەن. هەڵبەت ئەم شکستانە هەندێ باشیشی هەبووە، چونکە ئەم بارودۆخە بووبە هۆی ئەوەی کە هەروەك رابردوو بە دەمارگرژییانە سەیری رێبازەکانی گەشەسەندن نەکەین. جێی وەبیرهێنانەوەیە کە ناتوانین زۆرێك لە تیۆرەکانی پێشوو. بە تەواوی رەتبکەینەوە، بەڵکو بە سوود وەرگرتن لەم بۆچوونانە دەتوانین تیۆرگەلێك دابڕێژین کە باشتر واقیعییەتە بەرچاوەکانی کۆمەڵگا گەشەنەسەندووەکان روون بکەنەوە.

**شەپۆلی یەکەمی رەخنەکان:**

یەکەم شەپۆلی رەخنەگرتن لە کۆتایی ساڵانی ١٩٦٠دا بوو کە لە میانەیدا خوێندنەوەی نێوان سوننەت و نوێگەری کرا. چونکە بۆ ماوەیەك وەها وێنا دەکرا کە دامەزراوە تەقلیدییەکان لە هەمبەر نوێگەریدا لەمبەر دروستدەکەن، بە چەشنێك کە لە چوارچێوەی گەمەی کۆی گشتی سفر، نویگەری زۆرتر هەرەسهێنانی زۆرتری دامەزراوە تەقلیدییەکان لێدەکەوێتەوە.

بە بۆچوونی زۆرێك لە توێژەران پێناسەکانی پێشکەشکرا و سەبارەت بە سوننەت و نوێگەری وەك پێویست نەبوون، بەچەشنێك کە قووڵ نەبوونەوە و نەخوێندنەوەی وردی مۆدێرنیتە بووبە هۆی ئەوەی کە نەتوانرێت هەڵسەنگاندنێکی مانادار لە نێوان کۆمەڵگا گەشەسەندوو و گەشەنەسەندوو ئەنجامبدرێت. لەم رێڕەوەدا مودێرنیتە بە پێی مرۆڤی ئایدیالی رۆژئاوایی وێنا کراوە کە تیایدا مرۆڤی مودێرن، هاووڵاتییەکی



بەشداریکەر و هۆشیارە کە خاوەن کارامەیی تاکەکەسییە و دوور لە دەسڕۆیی و دەستێوەردانی فاکتەرە تەقلیدییەکان کاردەکات و خاوەنی زەینی کراوەیە کە ئامادەیی وەرگرتنی ئەزموون وێنای نوێی هەیە.

وەها دێتە بەرچاو کە دابەشکردنی دوویانەی سوننەت و نوێگەری ناواقعییی بێت، چونکە زۆرێك لە کۆمەڵگا کۆنەکان لە ئێرانەوە بگرە تا چین و هیند خاڵی هاوبەشی کەمیان هەبوو و هەندێ جار جیاوازییەکان لە ناو خودی بازنەی سوننەتدا وەك جیاوازی نێوان سوننەت و مودێڕن دێتە بەرچاو. بەم پێیەش دەتوانین بڵێین کە رادەی یەکگرتوویی و گونجان (انسجام) لە کومەڵگا سوننەتییەکاندا کەمترە لە بەراورد لەگەڵ هەندێ جار کە پۆلین کردنەکان بە پێی پێوەری کات واتە پۆست مودێڕن، مودێڕن، مودێرن کراو، لە دۆخی مودێڕن بووندا، پێش مودێرن یا خود نامودێرن، شێوەیەکی گشتگیریان هەیە و بە رێژەیەکی بەرچاو لە گرنگی بەهای ونۆرماتیڤانەیان کەم دەبێتەوە. لەژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا باشتر دەتوانین گۆڕانە کۆمەڵایەتییەگەورەکان روون بکرێتەوە. ئەم جۆرە پۆلین کردنە دەبنە هۆی ئەوەی کە بەبێ هێنانە ناوەوەی پرسگەلی نەتەوە، نەژاد، ئایین، کولتوور و ناوچەی بۆ توێژینەوەکانماندا لە پێودانگی سیاسی، ئابووری سوود وەربگرین. بەم پێیەش دەتوانین وڵاتانی وەك ژاپۆن، مالزی، سەنگاپور و رووسیا بە وڵاتی مودێڕن هەژمار بکەین. بەڵام ناتوانین بە ((رۆژئاوایی)) ناویان ببەین، مۆدێرنیتە پەیوەندییە ئاڵۆز و راستەقینەکانی نەژادی، کولتوور، جوگرافیا، ئایین، سیاسەت، ئابووری و تەکنۆلۆژیای بە کەمکرنەوەیان تا ئاستێکی ئەبستراکت. ئەم پەیوەندییەی شێواندووە. لەم باسەدا ((مودێڕن بوون)) بە مانای هاوبەش بوون لە گشتێکی کۆمەڵایەتی و کولتووری لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو لە رووی تەکنۆلۆژیا و لێك جیاکردنەوەی دین دوو دەسەڵات دێت، بۆ نموونە رۆژئاوا. ئەمەش لە کاتێکدایە کە ژیان لە بارودۆخی نامودێڕندا، هەلومەرجی خاوەن ئاڵۆزی کەمتر بەرجەستەدەکات.





له راستیدا بەکارهێنانی زاراوەی مودێرن لە ئەوروپای سەدەی هەژدەیەمدا بە واتای لێك جیاکردنەوەی کولتوور و کۆمەڵگای ئەوکات و سەردەمی کۆن دەهات. بەڵام بەکارهێنانی ئەم چەمکە لە سەدەی بیستەمدا بۆ لێك جیاکردنەوەی کولتوور و کۆمەڵگای ناوچە ((دواکەوتوو)) و ((تازە هەڵداو)) بە کار هات. چەمکی مودێرنیتە بریتییە لەوەی کە مێژووی بەرهەمی توانایییە شاراوەکانی (بالقوه) مرۆڤ نییە، بەڵکو نیشاندەری کۆمەڵە وەرچەرخانێکی جۆراجۆرە کە لەگەڵ پلانێکی جیهانی یەك دەگرێتەوە. ئەمەش لە کاتێکدایە کە کۆمەڵگاکانی لە دۆخی بنیاتنانەوە بۆیان نییە کە تەنانەت دەربڕینی جیاواز لە مێژوو و کولتوورەکەیان بخەنە روو. لەم چەشنە بارودۆخەدا پێشنیار دەکرێت کە کۆمەڵگا مودێرنەکانی ئەم دواییە (متأخر) دەبێ هەمان رێگە ببڕن کە وڵاتە پێشەنگەکان بڕیویانە. بەم جۆرەش پێویستە ئەم وڵاتانە فێری ئەزموونگەی پێشەنگەکانیان ببنەوە و ئەم نموونە پەیڕەوی بکەن کە بتوانن رێڕەوی ((گەشەسەندن)) بگرنەبەر. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم بابەتە کە سوننەت و نۆێگەری پێویستە لە چوارچێوەی گەمە کۆی گشتی سفر خوێندنەوەی بۆ بکرێت، پێویستە ئاماژە بدەین کە لە زۆرجار نەتەنیا سوننەت و نموونەگەلی رەفتاری سوننەتی بە فاکتەری بەربەست نانەوەی گەشەسەندن هەژمار ناکرێن، بەڵکو زۆرجار پێگەی سوننەت دەتوانێت پشتیوانی بەهێزی مەشروعییەت بەخشین و جێگیرکردنی نموونەی گەشەسەندنی سیاسی هەژمار بکرێت و ئەم دوانە تەواوکەری یەکتربن. لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا ئەگەری ئەوە هەیە کە زۆرێك لە رەفتار و دامەزراوە تەقلیدییە نووستووەکان. لە پرۆسەی نویگەریدا سەرلەنوێ چالاك ببنەوە و گەشەسەندنی سیاسی و کولتووری بخەنەسەر رێرەوێکی نوێ کە لەگەڵ بارودۆخی گۆڕدراوی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی بگونجێت و وەڵامدەرەوەی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا بێت.

بەپێی ئەم شیکردنەوەیە لەبڕی ئەوەی وەها وێنا بکەین کە بە سەرهەڵدانی پێکهاتەگەلی نوێ، پێکهاتە کۆنەکانی سوننەت لە بەین دەچن. دەبێ وەها وێنا بکەین کە وەك زانستی جیۆلۆجی پێکهاتە نوێیەکان لەسەر پێکهاتە کۆنەکان



دادەمەزرێن. بەم جۆرەش پێودانگی بەهادان تەنیا بەپێی کات هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، نەك بە پێی نوێ بوونی پێکهاتەکان.

بەم پێیەش رێبازی پێداچوونەوە خوازی چاکسازی سەبارەت بە تیۆری نوێگەری رووبەڕووی زنجیرە کەم و کوڕی چەمکی بووە و هەرگیز نەیتوانی بە تەواوی لە روانگەی کامڵبوونی تیۆری نوێگەری رزگار بێتەوە. لەم رێڕەوەدا. لە پەڕاوێزی تیۆری نوێگەری پێداچوونەوە خوازی، شایەتی هەرەسهێنانی سوننەت دەبینەوە و مەشروعییەتی دامەزراوە سوننەتییەکان لە چوارچێوە نموونەگەلی عەقڵانی و یاسای بەدیدێت. سەرەڕای هەوڵدان بۆ لێك نزیك کردنەوەی سونەت و نوێگەری، بەڵام لە رووی پراکتیکییەوە پێداچوونەوە لە تیۆری نوێگەریدا نەیتوانی گرفتی پەیوەندی نێوان بگۆڕە سیاسی و ئابورییەکان، یاخود بەواتایەکتیر پرسی گەشەسەندنی سیاسی و گەشەسەندنی ئابووری چارەسەر بکات.

## شەپۆلی دووەمی رەخنەکان:

دووەمین شەپۆلی رەخنەکان لە تیۆری نوێگەری، تایبەتە بە رێبازی حکوومەتی بەهێز. لێرەدا لە بری جەختکردنەوە لەسەر لاوازی تێگەیشتن لە سوننەت و نوێگەری، هەندێ لە توێژەرانی زانستە سیاسییەکان توانایی بەردەوام بوونی دیموکراسی بە شێوەیی رۆژئاوا لە کۆمەڵگاکانی لە دۆخی گەشەسەندندا خستویانەتە ژێر پرسیارەوە. ئەزموونە سەرەتاییەکانی زۆرێك لەم کۆمەڵگایانە کە زۆربەیان دامەزراندنی سیستەمی بە خۆوە بینی، بووە هۆی دەستێوەردانی سوپا لە کاروباری سیاسیدا و تەنانەت زۆر جار شەڕی ناوخۆیی لێکەوتەوە. لەم چەشنە بارودۆخەدا سەقامگیری سیستەمی سیاسی (نەك دیموکراسی) لە ئامانجە سەرەکییەکانی گەشەسەندنی سیاسی هەژمار دەکرێت.

هاوکات لەگەڵ سەرهەلدانی پێداچوونەوە خوازی نوێگەری و رەخنەگرتن لە حکوومەتی بەهێز، ((تیۆری وابەستەیی (نظرية التبعية))) هاتنە ناو پانتای





تویژینەوەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا. هەندێ لەو ڕەخنانەی کە پێشتر لە لایەن پێداچوونەوە خوازانی نوێگەرییەوە گەڵاڵە کرابوو، لە بۆچوونە سەرەتاییەکانی ڕێبازی وابەستەیدا دەبینرا. بە هەر حاڵ تیۆری وابەستەیی لە ئەنجامی ناکارامەیی ناوەڕۆکی تیۆری نوێگەری نییە، بەڵکو هەڵقوڵاوی پشتگۆی خستنی ڕەهەندی ئابووری گەشەسەندن لە لایەن تیۆری نوێگەرییەوەیە بە تایبەتیش چەوساندنەوەی جیهانی گەشەنەسەندوو لە لایەن دەوڵەتە گەشەسەندووەکانەوە.

لە ڕاستیدا، تیۆری وابەستەیی، ڕەخنەیەك بوو کە ئاراستەی تیۆری نوێگەری کرا و تیایدا تیۆری نوێگەری بە پاساوێکی ئایدیۆلۆژیکی بۆ چەوساندنەوەی باشوور هەژمار دەکرد. لە بەرامبەردا، لایەنگرانی ڕێبازی نوێگەری، تیۆری وابەستەییان بە گورزی ئایدیۆلۆژیکی مارکسیستەکان دژی جیهانی سەرمایەداری هەژمار دەکرد. یەکێك لە ڕەخنەکان ئەوە بوو کە تیۆری وابەستەیی گشت ناوچەکانی (پەراوێز) بە یەکدەست و هاوشێوە هەژمار دەکرد و بەبێ ڕەچاوکردنی ڕێژەیی مێژوویی گەشەسەندن کۆمەڵگایەکی تایبەتدا، بە شێوەیەکی ئەبستراکت خوێندنەوەی بۆ پرسەکانی دەکرد. بەم جۆرەش چونکە چەمکی وابەستەیی بە دیاردەیەکی جیهانی و گشتگیر دەزانرا، پانتایەکی بەرتەسکی بۆ شیکردنەوەی پرۆسەی گەشەسەندن و گەشەنەسەندن لە سیستەمە جۆراوجۆرەکانی حکوومەتی بە جێ دەهێشتەوە ڕەخنەگران لەو بڕوایەدا بوون کە بە هۆی جەخت کردنەوەی لە ڕادەبەدەری تیۆری وابەستەیی لە سەر فاکتەرو هەلومەرجی دەرەکی، فاکتەرە ناوخۆییەکانی وەك جیاوازی چینایەتی و حکوومەت پشتگوێ دەخات و بە هۆی ئەم ڕەچاونەکردنەش، ئەم ڕێباز بەپێشکەشکردنی وێنایەکی تارماوی و ناواقیعییانە لە وڵاتە پەراوێزەکانی هەڵچوو (منفعل) تاوانبار دەکرێت. گشت ئەم ڕەخنانە زەمینەی لەباریان بۆ پێداچوونەوە لە تیۆری وابەستەیی کلاسیك فەراهەم کرد. بە جەشنێك کە لە تێورە نوێیەکانی وابەستەیدا، هەندێ لە گریمانە سەرەکییەکانی تیۆری کلاسیك گۆڕدراون و لەبڕی ڕەچاو کردنی وابەستەیی وەك پرۆسەیەکی گشتگیر، دەرەکی و ئابووری، وەك



پروسەیەکی کۆمەڵایەتی، ئابووری و ناوخۆیی سەیر دەکرێت کە دەکرێ گەشەسەندنی بەردەوامی لێبکەوێتەوە. لەم ڕەوتەدا ڕێبازی نوێ جەخت لەسەر یەکێتی سێ لایەنەی دەوڵەت، سەرمایەی ناوخۆیی و سەرمایەی نێودەوڵەتی و وابەستەیی بەرهەمهێنەر دەکاتەوە و زۆرتر لە تیۆرییەکانی پێشوو، هەلومەرجی مێژوویی وابەستەیی و توێژنەوەگەلی بابەتیانە ڕەچاو دەکات. هەروەها ئەم ڕێبازە نوێیە، وابەستەیی و گەشەسەندن دژ بەیەك نازانێت، بەڵکو بڕوای بە پێکەوە ژیانی نیوانیاندا هەیە. لەسالانی ١٩٧٠دا لە ژێر کاریگەری سەرهەڵدانی کۆمەڵگا تازە پیشەسازییبووەکانی ئاسیای دوور، قەیرانی دەوڵەتە سۆسیالیستییەکان و هەرەسهێنانی ئابووری جیهانی سەرمایەدارییی، تیۆری ((سیستەمی جیهانی)) پشت بەستراو بە ڕێبازی وابەستەیی گەڵاڵە کراو سەرەڕای هەژمارکردنی ئابووری جیهان بە یەکەی شیکردنەوە، بەپێی سێ دەستە خوێندنەوەی سیستەمی مێژووییان کرد، کە بڕیتی بوون لە: ناوەند، نیمچە پەراوێز و پەراوێز بەپێی ئەم بیرۆکەیە گشت ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان لە چوارچێوەی سیستەمی جیهانیدا شیدەکرێنەوە. هەروەها گشت بەشەکانی سیستەم پێکەوە گرێدراون و دەتوانرێ گشت وەرچەرخانی ناوەوەی سیستەم لە ڕێگەی فاکتەرە ناوخۆییەکانەوە ڕوون بکرێتەوە. بەپێی ئەم شیکردنەوەیە، سیستەمی مودێڕنی جیهانی خاوەن خەسڵەتی کاتی و شوێنییە. لەم چوارچێوەیەدا، خەسڵەتەکانی شوێن. دابەشکردنی جوگرافیایی و جیۆپۆلیتیکی، سیستەمی جیهانی بەپێی ناوەند، نیمچە پەراوێز و پەراوێز وەسفدەکات، کە هەر یەك لەمانەش ڕۆڵ و کارکردی جیاوازی ئابووریی هەیە کە لە میانەیدا پەیوەندی چەوسێنەرانەی ناوچە دەوڵەمەند و هەژارەکانی جیهان بە پێی گەمە بەکۆی گشتی سفر ڕوون دەکرێتەوە. خەسڵەتە زەمەنییەکانی ئەم سیستەمە ڕێڕەو، ناکۆکی، قەیران و وەرچەخانەکان لە خۆ دەگرێت کە ڕەنگدەرەوەی هەڵکشان و داکشانی ئابووری جیهانییە.

گەڵاڵە کردنی چەمکی ((نیمچە پەراوێز)) لە ڕووی تیۆریکەوە ئەم دەرفەتە بۆ توێژەر دەرەخسێنی کە شیکردنەوەی ئاڵۆزی و ناوەڕۆکی وەرچەرخانی ئابووری جیهانی





سەرمایەداری بکات. ئەم نموونە سێ لایەنییە، دەرفەتی چوون بەرەو سەرەوە (بەرز بوونەوەی پەراوێز بۆ نیمچە پەراوێز یا خود چوونی نیمچە پەراوێز بەرەو ناوەند) هەروەها بەرەو خوارەوە (دابەزینی ناوەند بۆ نیمچە پەراوێز، هەروەها دابەزینی نیمچە پەراوێز بۆ پەراوێز) فەراهەم دەکات. بوونی لایەنی نیمچە پەراوێز لەم نموونەیەدا، توانایی بە ڕێبازی سیستەمی جیهانی دەبەخشێت بۆ خۆیندنەوەی گۆڕانی پێگەی دەوڵەت بە هۆی ناکۆکی و قەیرانگەلێکەوە کە بە هۆی کارکردنی سیستەمی جیهانی سەرمایەداری سەری هەڵداوە. تیۆری سیستەمی جیهانی، ڕۆانگەی تیۆری وابەستەیی لە ڕووی ئاراستە و ڕێڕەوی گەشەسەندنەوە دەخاتە ژێر ڕەخنە گرتندا و ئەم بۆچوونە ڕەتدەکاتەوە کە پەراوێز هیچ کاتێك گەشەناکات و ناوەندیش پەراوێز دەچەوسێنیتەوە. لەگەڵ کردنی چەمکی ((نیمچە پەراوێز)) دەبێتە هۆی ئەوەی کە چیتر پێویست بەوە ناکات کە بابەتی ڕێرەوی گەشەسەندنی سەربەخۆ لە پەراوێزدا خوێندنەوەی بۆ بکرێت یەکێك لەو ڕەخنانەی کە ئاراستەی تیۆری سیستەمی جیهانی کرا ئەوە بوو کە جەخت کردنەوەی لەڕادەبەدەر بەسەر ڕۆڵ و کارکردی سیستەمی جیهانی دەبێتە هۆی کە بەهایەکی کەم بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و کەسایەتی و لێهاتوویی ئەم کەسانە بدرێن. هەروەها زاڵکردنی ڕێساکانی گەمە بە کۆی گشتی سفر دەبێتە هۆی ڕەچاو نەکردنی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان ناوچە گەشەنەسەندووەکان و گەشەسەندووەکان. لە قۆناغی دواتر بەپێی ئەو ڕەخنانەی کە ئاراستەی تیۆری سیستەمی جیهانی کردن، هەروەها بەرچاوگرتنی واقیعییەکانی نێوان پەراوێز و ناوەند و پەیوەندی نێوان ئەم دوانە، لە ڕوانگەی نوێدا بۆگەیشتن بە بووژانەوەی ئابووری، مەرج نییە پەیوەندی لەگەڵ سەرمایەداری جیهانی بپچرێت. لە ڕوانگەی نوێدا سەرەڕای ئەوەی کە ئەگەری ئەوە هەیە هەندێ لە کۆمەڵگا پەراوێزەکان بارودۆخەکەیان باشتر بکەن، بەڵام زورێك لەم کۆمەڵگایانە تەنیا هەوڵی چارەسەرکردنی قەیرانە کاتییەکان دەدەن و ئەگەری ئەوە هەیە نەتوانن بەگەشەسەندنی تەواو و بەردەوام بگەن.



لە سەرەتای ساڵانی ١٩٧٠ دا بابەتی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی دەوڵەت بوو بە چەقی شیکردنەوەی وەرچەرخانی سیاسی لە کۆمەڵگا گەشەسەندووەکاندا. لە ژێر کاریگەری ئابووری سیاسییەوە و باس لە دوو جۆری ئابووری سیاسی لێك جیاواز دەکرێت، قوتابخانەی یەکەم وەرگیراو لە مارکسیزم بوو کە هەوڵی بەرپەرچدانەوەی ڕوانگە یەکپارچە سازییەکانی تیۆری وابەستەیی دەدا، هەروەها چونێتی بەکارهێنانی هێزی کار و دامەزراوە کۆمەڵایەتی (شێوازی بەرهەم هێنان) و دواجار جەختی لەسەر پەیوەندی چینایەتی (بۆرژوازی مترۆپۆل) لەگەڵ دامەزراوە دەوڵەتییەکانی دەرکردەوە. لە کاتێکدا کە قوتابخانەی دووەم لە چوارچێوەی ئابووری سیاسیدا، جەختی لەسەر پرۆسەی ریزبەند کردنی سیاسەتی گشتی دەرکردەوە و وەك ئابووری سیاسی ڕادیکال بزاڤێك بوو لە ڕوانگەی مایکرو تیۆرییەکانی نوێگەری و وابەستەیی بەرەو ڕێبازێکی بچووکتر (واتە لە مایکرو تیۆرییەوە بەرەو میکرو تیۆری). لە ڕاستیدا ڕوانگەی خۆیندنەوەی سیاسەتی گشتی، لە ڕووی مەیلدارییەوە لە هەمبەر ئابووری سیاسی ڕادیکال لە ئاستێکی بچووکتر (میکرو) دایە. بە چەشنێك کە تەنیا سەرقاڵی ڕێکخستنی سیاسەت و بڕیاردان لە ناو خودی ئۆرگانی دەوڵەتدایە. لە هەلومەرجێکدا کە ڕوانگەی ڕادیکال پابەندی خۆی بەو وەرچەخانانە کە زۆرتر وەك گۆڕانکارییەکی شۆڕشیانە بەرجەستە دەبنەوە. ڕادەگەینێت، ڕوانگەی سیاسەتی گشتی سەرەڕای جەختکردنەوەی لەسەر بە ئەنجام گەیاندنی سیاسەتی درێژخایەن، بە ئاشکرا یا خود نا ئاشکرا پابەندی خۆی بەرسەقامگیری سیاسی ڕادەگەینێت.

بەگشتی ڕێبازەکانی ئابووری سیاسی، ڕادیکال و پارێزگار دەتوانن جۆرە ئاراستەیەك بۆ خوێندنەوەی وەرچەخانە سیاسییەکانی فەراهەم بکەن. لەم ئاراستەیدا بە شێوەیەکی سەرەکی جەخت لەسەر دامەزراوە دەوڵەتی، گرووپ و کەسانێك دەکاتەوە کە کونتڕۆڵی ئەم دامەزراوەیە و پەیوەندییەکانی لەگەڵ هێزە کۆمەڵایەتییەکان (لە ناوەوە و دەرەوە) لە دەستدایە. لێرەدا خوێندنەوەی سێ ئاست دەکرێت کە بریتین لە: ئابووری نێودەوڵەتی، ژینگەی سیاسی و دەوڵەتی نەتەوەی،





ژینگەی ئابووری و سیاسی ناوخۆ. ئەم ڕێبازە وێکچوونی زۆری بە قوتابخانەی ڕادیکالی ئابووری و سیاسی هەیە، بەم جیاوازییە کە لەم ڕێبازەدا، خۆی لە جەختکردنەوەی رووت بەسەر شیکردنەوەی چین دوور دەخاتەوە، چونکە یەکێك لەم کەم و کوڕییانەی کە لە شیکردنەوەی چیندا بوونی هەیە ئەوەیە کە ئەم شیکردنەوەیە ڕەچاوی نەتەوە و نەژادەکانیتر ناکات.

**قەیرانی تیۆر دارِشتن:**

ئەزموونی دەیەکانی رابردوو هێمای ئەوە بوون کە هیچ کام لە مایکرۆ تیۆرییەکانی (مارکسیزم و لیبرالیزم) نەیانتوانیوە روونکردنەوەی پێویست بۆ نموونە جۆراوجۆرەکانی گەشەنەسەندن کە لە باشووری گۆی زەوی گەلالە کران، پێشکەش بکەن. هەروەها ئەم تیۆرییانە نەیانتوانیوە پێشبینی لە وەرچەخان و شکستەکانی ئەم کۆمەڵگایانە بکەن.

بە گشتی لە تیۆرییەك چاوەڕوان دەکرێ کە گریمانە بوون ناسی ئەپستمۆ لۆژییەکانی ئەم تیۆرییە بە راشکاوی بخریتە روو، ئەمەش بە دەربڕی چەمکە سەرەکییەکانی واقیعییەت و ناوەڕۆکی کۆمەڵگا هەژمار دەکرێت. چونێتی تیگەیشتن لە واقیعییەت بەپێی بارودۆخی زەمەنی و شوێنی جیاواز دەتوانێت لە چۆنێتی شیکردنەوەی رووداوەکان و دواین ئەنجامگیرییەکانی رۆڵی سەرەکی هەبێت. لە راستیدا، سەبارەت بە کۆمەڵگا گەشەسەندووەکان ئێمە رووبەڕووی بەشگەلی بچووك و گەورە لە واقیعییەتەکان دەبینەوە کە لە پاڵ یەکتر دانانی ئەم بەشە لێك دوورانە و هەڵنجێنانی مایکرۆ تیۆرییەك یا خود پێشکەشکردنی نموونەگەلی گەشەسەندن و دوای ئەمەش ڕێکخستنی ستراتیژییە جۆراوجۆرەکان، بە واتای نمایش کردنی زنجیرەیەك لە ناواقعییەتە زەینیمەکانی پەرت و بلاو هەژماردەکرێت.

هەروەها لە تیۆرییەکی سیاسی وەها چاوەڕوان دەکرێ کە گریمانە نۆرماتیڤەکان و ئەولەوییەتە سیاسییەکان بە تەواوی بخاتە روو. لەم ڕێڕەوەدا پێویستە چەمك و



بنەماتیۆریکییەکان لەگەڵ گریمانە سەرەکییەکان بگونجێن و ڕەنگدانەوەی جۆرە هەماهەنگییەکی لۆژیکی و وردبینییەك بێت.

چونکە لە خستنەڕووی تیۆرەکانی گەشەسەندن جۆرە پێکەوە گرێدانێك (التقاط) دەبینین کە پشت بەستراو بە گریمانە بوون ناسی- ئەپستمۆلۆژییەکانەوە، کەواتە ناتوانین چاوەڕوان بین کە چەمکە بەکارهاتووەکان لە تیۆردا خاوەن دەربڕین و کارکردێکی یەکسان بن، لەم رووەوە لە کاتی بەکارهێنانی زاراوەی دیموکراسی، بەشداری سیاسی، چین لە چوارچێوەی رێبازەکان، قوتابخانە و کۆمەڵگاکان رووبەڕووی هەڵنجێنانی جۆراوجۆر دەبینەوە و ناکرێ وەها وێنا بکرێت کە گەشەسەندنی سیاسی بە ئاراستەیەکی دیارکراو لە کولتوورە سیاسییە جۆراوجۆرەکاندا جێبەجێ بکرێت.

پێویستە تیۆری گەشەسەندنی سیاسی پانتای کارکردەکەی دیار بکات و ئەو هەلومەرجەی کە تیایدا ئیعتباری پێویست بەدەستدێنێت، پێناسەبکات. لەم رووەوە زۆرجار بە هۆی ناوەڕۆکی بەهای و نۆرماتیڤ بوونی گەشەسەندنی سیاسی. تیۆرە قەدبڕەکان { تیۆرێك کە لە ئەنجامی پێکەوە گرێدانی دوو تیۆری پێکهاتبێت} کارکردی زۆرتان هەبێت. چونکە لە چوارچێوەی ئەم چەشنە تیۆرانەدا، بە هۆی کەمکردنەوەی {توانای} بگۆڕە بەکارهاتووەکان و بەهۆی دیارکردنی پانتای فیزیکی، کولتووری و جیۆپۆلیتیکی دەتوانێت وردتر و دڵنیاتر کار بکات، ئەگەرچی لەوانەیە لەم ڕەوتەدا توێژەر بە پارێزگاریی بوون تاوانبار بکرێت.

بە پێی ئەو شتانەی کە باسکران لە پراکتیکدا رووبەڕووی هەندێ تیۆری دەبێتەوە کە توانیویانە لە ساڵانی ١٩٥٠ وە وەلامدەری پێداویستییەکانی توێژینەوەی گەشەسەندن بن. لە توێژینەوەکانی سەبارەت بە گەشەسەندن بە ئامانجی پێدانی راسپاردەی ستراتیژی کە شیاوی جێبەجێ کردن لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندابێت سوود وەرگیرا. بەڵام لە پراکتیکدا بەهۆی کەڵەکە نەبوونی واتا ئەزموونییەکان، توێژەرانی گەشەسەندنی سیاسی نەیانتوانیوە بە دواین ئەنجامگیری بگەن و راسپاردەی کاریگەر بۆ دەرباز بوون لە گەشەسەندن بخەنەڕوو. سەرەڕای ئەم شکستانە، بە درێژایی پێنج





دەیە تیۆری داڕشتن لە بارەی گەشەسەندنی سیاسییەوە، زۆرێك لە خاوەن رایەكان سەبارەت بەو بگۆڕانەی كە راستەوخۆ پەیوەندییان بە گەشەسەندنی سیاسییەوە هەیە، كۆ دەنگن،ئەگەر چی هەنۆكەش لە بارەی بگۆڕگەلێك بە رێككەوتن نەگەیشتوونە.

هەنۆكە هەوڵ بۆ پێكەوە گرێدانی توێژینەوەكانی گەشەسەندن بە ستراتیژ و هەڵوێستە سیاسییەكان دەدرێت.

**ئەنجام:**

بە درێژایی چوار دەیە بواری گەشەسەندن لە ژێر كاریگەری سێ قوتابخانەی نوێگەرایی، وابەستەیی و سیستەمی جیهاندا بووە. هەریەك لەم قوتابخانەیانە خاوەن گریمانەگەلی تیۆریك و نەریتی بۆچوونی تایبەت بە خۆیان بوونە، بەم پێیەش هەر یەكیان چارەسەرییەكی تایبەتی بۆ گەشەسەندن پێشكەشكردووە. كاتێك كە یەكێك لەم ریبازانە رەخنەی لێدەگیرا، گریمانەكانی تووشی هەموار كردن دەبوونەوە و بۆ هەڵوێست وەرگرتن هەمبەر رەخنەگران، دەستوورێكی نوێی كاركردنیان لە بەرنامەی توێژینەوەكانیاندا دەگونجاند.

تیۆرییەكانی نوێگەری كە لە ساڵانی ١٩٥٠ دا گەڵاڵە كران لە ژێر كاریگەری تیۆری كامڵبووندا بوون كە ئەم پرۆسەیان بە پێشترەوە، درێژخایەن و شۆڕشانە وێنایان دەكرد ئەم جۆرە تیۆریانە كە لە تیۆری كاركرد گەرایی ((تالكوت پارسونز)) وەرگیرابوون بڕوایان بە ناسازگاری نێوان سوننەت و نوێگەری هەبوو.

لە كۆتایی ساڵانی ١٩٦٠ دا هێرش كرایە سەر تیۆرییەكانی نۆیگەریدا و بەم جۆرش زۆرێك لە توێژەران گۆڕانكارییان لە گریمانە سەرەكییەكانی خۆیاندا ئەنجامدا، بەرادەیەك كە بەو بڕوایە گەیشتن كە سوننەت دەتوانێت رۆڵی سوودمەند لە گەشەسەندندا بگێڕێت و جیهانی گەشەنەسەندوو پێویستە بە پێی پانتای كولتوورییەكەی درێژە بە رێگەی خۆی بدات.



لەسەرتای ساڵانی ١٩٦٠ دا دوای شكست هێنانی پلانی نەتەوەیەكگرتووەكان بۆ گەشەسەندن لە ئەمریكای لاتین و توند بوونی قەیرانی ماركسیزمی ئۆرتۆدۆكس لە وڵاتانی ئەم ناوچەیەدا، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم بارودۆخە قوتابخانەی وابەستەیی سەری هەڵدا ئەم رێبازە پەیوەندی نێوان كۆمەڵگاكانی رۆژئاوا و جیهانی گەشەنەسەندوو بە سەپێنراو و چەسپێنەرانە وەسفدەكرد و گەشەسەندنی و وابەستەیی ئابووریی بە پێكەوە ناگونجاو وێنا دەكرد. بەم پێیەش جیهانی گەشەنەسەندوو بۆ رزگار بوون لەم دۆخە، پێویستە پەیوندییە ئابوورییەكانی لەگەڵ رۆژئاوا بپچڕێنێت و سەربەخۆ كار بكات. لە ساڵانی ١٩٧٠ دا رەخنە لەم رێبازە گیرا. بە چەشنێك كە زۆرێك لە توێژەرانی لایەنگری ئەم رێبازە لە بۆچوون و گریمانەكانیدا پێداچوونەكانیاندا پێداچوونەوەیان كرد.

بەم جۆرەش لایەنگری قوتابخانەی وابەستەیی بەم بڕوایە گەیشتن كە وابەستەیی تەنیا لایەنی ئابووری نییە، بەڵكو پرۆسەیەكی سیاسی و كۆمەڵایەتی كە تەنیا لە پەیوەندییە دەرەكییەكاندا كورت نابێتەوە بەڵكو پەیوەندییەكی ناوخۆییە و بە پێی بارودۆخگەلێكی تایبەتی مێژوویی روو دەدات، بۆیەش گەشەسەندن دەتوانێت لە پاڵ وابەستەییدا بەدی بێت.

لە دوای سەرهەڵدان ولاتانی تازە بە پیشەسازی بووەكانی ئاسیای دوور، قەیران لە نێوان كۆمەڵگا سۆسیالیستییەكان و رەوتی روو لە دابەزینی ئابووری جیهانی سەرمایەداریی، تیۆری سیستەمی جیهانی گەڵاڵە كراو لەم تیۆرەدا یەكەی شیكردنەوەی ئابووری، جیهانێك بوو كە سیستەمێكی مێژووییە و لە سێ لایەنی ناوەند، نیمچە پەراوێز و پەراوێز پێكهاتووە. بە بۆچوونی تیۆر داڕێژەرانی ئەم قوتابخانەیە، ئابووری جیهانی سەرمایەداری لە كۆتاییەكانی سەدەی بیستەم بە قۆناغێكی گوزار دەكات كە ئەگەری ئەوە هەیە ریڕەوی مێژوویی مرۆڤایەتی بگۆڕیت.

لە كۆتایی ساڵانی ١٩٧٠ دوای رەخنەگرتن لە هەندێ لە گریمانە تیۆریكییەكانی ئەم قوتابخانە، گۆڕانكاریگەلێك بە سەریدا هات بە رادەیەك كە زۆرێك بەو بڕوایە گەیشتن كە چەمكی سیستەمی جیهانی ئامرازێكی لێكۆڵینەوەیە نەك واقیعییەتێكی عەینی. بەم





جۆرەش توێژینەوەکان بەرەو ئاستی نێودەوڵەتی و نیشتیمانی چەقی گرت و بۆ کامل کردنی توێژبەندی کۆمەڵایەتی بەکارهێنرا.

ئەمڕۆکە وەها دێتە بەرچاو کە بواری گەشەسەندن بەرەو هێنانەوەی جۆرە سەنتزێك دەجوولێتەوە. بە جۆرێك کە هەندێ لە توێژەران لە ژێر ناوی سەنتز ((ئابووری سیاسی نوێی بەراوردکاری)) ناودەنێن. هەروەها گرووپێکیتر لەو بڕوایەدان کە لە نێوان ڕێبازەکانی وابەستەیی ستراکتۆری، سیستەمی جیهانی و نوێگەری کولتووری، جۆرە هاوبەندییەك بەدیهاتووە.

بە گشتی ڕێبازە ناوبراوەکان لە بڕی چەق گرتن بەسەر نموونەگەلی ئایدیالی مودێڕنیتە و سوننەت و لەبڕی پێشکەشکردنی نموونەیەکی جیهانی وابەستەیی و گشتێتییەك (کلیت) لە سیستەمی جیهانی، هەنوکە سەرەڕای گەڕانەوە بۆ مێژوو، ڕەچاوی بابەتە دیارەکانی مێژوو دەکات و پرسیارگەلی وەك هۆی هەرەس هێنانی سوڤیەت و چونێتی سەرهەڵدانی کۆمەڵگا تازە بە پیشەسازی بووەکانی ئاسیای دوور- گەڵاڵەدەکات. لێکۆڵینەوە نوێیەکان لە بواری گەشەسەندنی سیاسیدا خەسڵەتی شیکردنەوەی فرە دامەزراوەیی هەیە و توێژەران لە بڕی جەختکردنەوە و چەق گرتن بەسەر بگۆڕە تایبەتەکان، پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان دامەزراوە جۆراوجۆرەکان، ڕەچاو دەکات. لەم ڕووەوە لە چوارچێوەی ئەم توێژینەوانەدا جەخت لەسەر پەیوەندی دوو لایەنەی وەك خێزان، ئایین، گرووپە نەژادییەکان، چین، دەوڵەت، بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان، کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و ئابووری جیهانیی بۆ ڕێکخستنی گەشەسەندنی مێژوویی کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەم دەکاتەوە.

بەم جۆرەش لە توێژینەوە نوێیەکانی گەشەسەندندا لە بڕی ورد بوونەوە بەسەر فاکتەرە ناوخۆیی و دەرەکییەکان، جەخت لەسەر هەندێ ئالۆزەکانی گەشەسەندن دەکات. لەم ڕێگەیەشەوە دەکرێ بە هەڵسوکەوتێکی پاسۆلۆژییانە ڕێگەی پێچاوپێچی گەشەسەندن لە کۆمەڵگاکانی باشوور بەبێ ئەوەی کە بچێتە ژێر کاریگەری هەلومەرجی ئایدیۆلۆژیکی سیاسەتی نێودەوڵەتییەوە خوێندنەوەی بۆ بکات.



# بەشی سێیەم

## زەمینە کۆمەڵایەتییەکانی دیموکراسی و مەشروعییەتی سیاسی بۆ خوێندنەوەی سیستەمی سیاسی

کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان و بەراورد کردنیان لەگەڵ یەکتردا، جۆرە تایپۆلۆژییەکی سیاسی بۆ دیارکردنی پەیوەندی نێوان بگۆڕە جۆراوجۆرەکاندا هەڵدەبژێردرێت. بۆ نموونە گابریل ئالموند سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکان بە پێی پێودانگەکانی وەك فرەستراکتۆریی، پسپوری بوون، رادەی سەربەخۆیی رۆڵەکان، ستراکتۆرەکان و سیستەمە لاوەکییەکان (SUB-SYSTER) بەراوردیان بکات.

لەم ئاراستەیەدا، پۆلین کردنی سیستەمە سیاسییەکانی وەك باوکسالاری، میراتی، فیدرالی و ئیمپراتوری بۆرۆکراسی مێژوویی کە لەلایەن زانایانی وەك ماکس ڤێبر و ئایزنستات پۆلین کراون، بە کار بهێنرێت و خەسڵەتگەلی هەریەك لە سیستەمە سوننەتی و مودێرنەکان بەراورد و خوێندنەوەیان بۆ بکرێت.

ئالموند لە قۆناغەکانی دواتردا، بە ئیلهام وەرگرتن لەم پێودانگانە، سیستەمە سیاسییەکانی بۆ دیموکراتیك و تۆتالیتر دابەشکرد. لە روانگەی ئالموندەوە دەبێ جیاوازی سەرەکی نێوان ئەم دوو سیستەمە لە رادەی سەربەخۆیی و وابەستەیی ستراکتۆری و کارکردی هەریەك لەم سیستەمانەدا بدۆزینەوە. واتە لە سیستەمە تۆتالیتەرەکاندا ئەو رۆڵەی کە میدیاکان، پارتە سیاسییەکان، یەکێتییەکان و گرووپی بەرژەوەندی و گوشار، دەگێڕن، سەربەخۆ لە کونترۆڵی نوخبەی دەسەڵاتدار و بۆرۆکراسی حکوومەتی نییە. لە کاتێکدا کە لە سیستەمە پۆلۆرالیزمی و دیموکراتییەکاندا ئەم ستراکتۆرانە سەربەخۆیی زۆرتریان هەیە. کۆی ئەم تایبەتمەندییانە دەتوانێت کاریگەری لەسەر بڕیارەکانی سیستەمی سیاسیدا هەبێت.

بێگومان بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە توێژینەوەییانە، جۆرە تایپۆلۆژییەکی سادە لە سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکان کە تیایدا سیستەمەکان بەسەر دیموکراتیك، دیکتاتۆری و تۆتالیتەردا پۆلین دەکرێن، پیویستە. (لینز)یش بۆ شیکردنەوەی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان ئەم رێبازە پەیڕەوی دەکات و بۆ خوێندنەوەی رژێمی دیکتاتۆری ئیسپانیا بەکاری هێناوە. بۆ خوێندنەوەی پەیوەندی نێوان بگۆڕە جۆراوجۆرەکان پێویستە رەچاوی لێکۆڵینەوەکانی ((لیپست)) بکەین. لیپست بە

دابەشکردنی وڵاتان بەسەر دوو گرووپی کولتووری لێك جیاواز بە پێی ڕەهەندی گەشەسەندنی سیاسی، وڵاتان بەسەر ((کەمتر و زۆرتر دیموکراتیك))، پۆلین دەکات. لیپست گەشەسەندن، مەشروعییەت و کاریگەر بوون بە مەرجگەلی سەقامگیری سیاسی هەژمار دەکات. (هەڵبەت ئەو، ئەم دوو فاکتەرەی دوایی بە مەرجگەلی سەرەکی سەقامگیری ڕژێمە سیاسییەکان دەزانێت).

کەسانێك وەك (ئاکسیتن)یش بە پێی ئەم ڕوانگەیە سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکان شیدەکاتەوە. بەڵام ئەو بگۆڕانەی کە ئاکستین جەختیان لێدەکاتەوە لەگەڵ پێودانگەکانی لێکۆڵینەوەکانی لیپست جیاوازە تیۆری ئاکسیتن پشت بەم پرەنسیپە دەبەستێت کە هەرچەند دامەزراوە سیاسییەکان مەشروعییەتی زۆرتریان هەبێت، بەهەمان ئەندازە سەقامگیری سیستەمی سیاسی زۆرتر دەبێت. زیاد لەمەش، ئەو پەیوەندییەی کە لیپست لە نێوان گەشەسەندنی ئابووری و دیموکراسی دادەنێ، چونکە وەها دێتە بەر چاوکردنی بنەماکانی ئابووری سیاسەت، ڕەچاوی بنەما سیاسییەکانی ئابووری بکرێت.

ئەو بڕیارانەی کە گرووپی دەسەڵاتدار بۆ وڵاتە گەشەسەندووەکان دەردەکات، فاکتەرێکی گرنگن لە ڕێژەی بووژانەوەی ئابووری ئەم وڵاتانەدا، کە دەتوانێ پەیوەندی نێوان دیکتاتۆری و گەشەسەندنی ئابووری نیشانبدات. تا بکرێت باشترە دیموکراسی وەك دیاردەیەکی دووەم، واتە دوای بەدەستهێنانی گەشەسەندنی ئابووری ویستراو (مطلوب) گەڵاڵە بکرێت. لەوانەیە پۆلین کردنی کۆمەڵگاکان بە پێی ستراکتۆرە سیاسییەکانی ئەم کۆمەڵگایانە گرفتگەلی زۆر دروستبکات، بۆیە باشترە ئەم پۆلین کردنە بە پێی ستراکتۆرە کۆمەڵایەتییەکان ئەنجامبدرێت.

لە تایپۆلۆژی ((کرن هاوزر))دا. ستراکتۆرە کۆمەڵایەتییەکان کە ڕۆڵی ناوبژیوانی نێوان تاك و دەوڵەت دەبینن، ڕەچاو دەکرێت، کە لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی یەکێتییەکان بکرێت. ئەگەر ڕەخنەکانی وەك توکویل و ئۆرتگاگاست بە ڕەخنەکانی سی ڕایت میلز و هانا ئارنت پەیوەند بدەین، دەتوانین بە تایپۆلۆژییەکی نوێ بگەین.



مومکینە لە سیستەمە تۆتالیتارەکاندا بە هیچ شێوەیەك نموونە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان تێکەڵ بە یەکتر نەبن. تیۆری سەرەکی کرنهاوز ئەوە بوو کە نەبوونی ستراکتۆری ناوبژیوان وەك ئەنجوومەنەکان، لەوانەیە کۆمەڵگا ڕووبەڕووی گەشەسەندنی بزاڤی دیکتاتۆر ئاسا بکاتەوە. ئەم بە پشت بەستن بە بەڵگەی بەرچاو نیشاندەدات کە چۆن هەندێك لە دیموکراسییە سیاسییەکان بۆ سیستەمی تۆتالیتەر گۆڕدراون. یەکێك لە دیاردە گرنگەکانی سەدەی بیستەم سەرهەڵدانی ڕژێمگەلی تۆتالیتار بوو. هەڵبەت بە بڕوای هەندێ کەسی وەك مر، تەنانەت لە هەندێ سیستەمەکانی پێش پیشەسازیی، ڕەگەزگەلی تۆتالیتاریزمی سەدەی بیستەم دەبینرێن. تۆتالیتاریانیزمەکانی هاوچەرخ زۆر توندوتیژتر لە دیکتاتۆرییەکانی پێشوو هەڵسوکەوتیان کردووە، بە جۆرێك کە پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ لە بواری پەیوەندییەکان و بەکارهێنانی شێوەی کامڵکراوی توندوتیژی، شەپۆلێکی بەرفراوانی ترس و باڵادەستی سیاسییان بەدیهێنا. لە پراکتیکدا بینراوە کە هەندێ لە حکوومەتە دیکتاتۆرییە دزیوەکان، زۆر خێراتر و مەترسیدارتر لە ڕژێمێکی دیموکراتیك بڕۆخێنێت. بابەتی باسکراو بەشێك لە بەراوردکاری (توکویل)ە، کە تیایدا تۆتالیتاریانیزمی دیموکراتیك لە مودیلەکانی نازیزم و ستالینیزم دەستڕۆتر و مەترسیدارترە. لە بابەتەکانی تری ئەم توێژینەوەیە، خوێندنەوەی هەرەسهێنانی سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکانە. هەروەك بینرا، نیگەرانی ((کرن هاوزر)) لێرەدا کە هەرەسهێنانی سیستەمێکی پشت بەستراو بە دیموکراسی بە ڕژێمێکی تۆتالیتاری توندوتیژ دەگۆڕدرێت.

لینز توێژینەوە لەسەر ئەو مەیلانە دەکات کە لە میانەیدا حکوومەتی دیکتاتۆری بەرەو دیموکراسی یا تۆتالیتاریانیزم دەگۆڕدرێت، ئەم ئەنجامە دەگات کە ڕژێمە ناوبراوەکان لە ڕەوتی گوزاردانین و مومکینە خودی خۆیان ببنە هۆی ڕژێمێکی سیاسی سەقامگیر.





هانتینگۆن باسدەکات کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانین بە روونی پەیوەندی راستەوخۆی (ارتباط خطی) نێوان بگۆڕەکانی گەشەسەندنی سیاسی و ئابووری دیاربکەین. بە بڕوای هانتینگتۆن نابێت سەبارەت بە سەقامگیری سیستەمە دیکتاتۆرییەکاندا رەشبین بین، هۆی ئاماژە کردن بە روانگەکانی هانتینگتۆن لێرەدا، گرنگیدانی ئەو بە بوونی دیکتاتۆری لە سیستەمەکانی لە دۆخی گەشەسەندندا نییە، بەڵکو زۆرتر بە هۆی رەشبینی ئەو سەبارەت بە ئاسەوارەکانی گەشەی ئابووری بەسەر سیستەمە سیاسییەکاندایە.

لە خوێندنەوەکانی بەراوردکاریدا کە لەسەر سیستەمە ئاڵۆزە کۆمەڵایەتییەکان کاردەکەن، دەبێ لایەنە تایبەتییە مێژووییەکانی هەر کۆمەڵگایەك رەچاو بکرێت. بۆ تاقیکردنەوەی ئەم جۆرە خوێندنەوانە پێویستە، بەپێی جۆری سیستەمی سیاسی، سوود لە چەند پێوەرێکی ئەزموونی وەربگیردرێت. لەم توێژینەوەیدا، دەبێ پێناسەکان بە جۆرێك بخرێنەڕوو کە بە ئاسانی ولاتانی (دیموکراتیك) و (نا دیمکراتیك) لێك جیا بکرێنەوە. هەروەها پێویستە لە دیارکردنی وردی سیستەمە ((زۆرتر دیموکراتیك)) و ((کەمتر دیموکراتیك)) دوو دڵ بین. چونکە دیموکراسی بە تەنیا ناتوانێت دەربڕی چۆنێتی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بێت. بۆیە لەم خوێندنەوەیەدا، ولاتان بەسەر دوو دەستە دابەشدەکرێت و بەسەر سیستەمی (بالا) و (خواروو)، پۆلیننا‌کرێن. بێگۆمان پۆلینکردنی ولاتان، بە پێی بەرزترین رێژەی دیموکراسی و کەمترین رێژە لە پۆلینکردنی ولاتان بەسەر ((دیموکراسی لاواز)) و ((دیموکراسی بەهێز)) سەختترە. بەلام ئەگەری ئەوە هەیە کە لەم شێوازەدا، خوێندنەوەی ولاتانی وەك مەکزیك گرفتێك لێك دروستبکات. خودی ئەو هەلانەی کە بۆ پۆلینکردنی ولاتان دەدرێت، دەتوانێت پرسگەلێك دروستبکەن. لەم خوێندنەوەیەدا ئەو ولاتانەی کە نەریتی دیموکراسییان نییە، لە گرووپی لە دۆخی گەشەسەندندا جێ دەگرنەوە. بە ئەنجامدانی ئەم جۆرە توێژینەوانە دەتوانرێت سەرەڕای ناسینی بگۆڕە ئاڵۆزەکان کە هاتوونەتە ناو کاروباری



سیاسیدا، لە رێژەی ناکۆکی ناوخۆیی ولاتان لەگەڵ ناوچە کولتوورییە سیاسییەکان کەم بکرێنەوە.

یەکێك لە ئەنجامگیرییەکانی پەیوەندی نێوان سیستەمی سیاسی و رەگەزە پێکهێنەرەکانی، گەیشتن بە پەیوەندی نێوان دیموکراسی و گەشەسەندنی ئابوورییە. بە پێی ئەم شیکردنەوەیە هەرچەند ئاستی ژیانی نەتەوە باشتر بێت، بەهەمان ئەندازە لە دیموکراسییەکی باشتر بەهرەمەندە. لەسەردەمی ئەرستووە تا ئەمرۆکە، باسگەلی زۆر لەسەر پەیوەندی نێوان خۆشگوزەرانی ئابووری و دیموکراسی کراوە. بە بۆچوونی ئەرستۆ تەنیا لە کۆمەڵگایەکی خۆشگوزەراندا دەتوانرێت هەل و مەرجێك بهێنێتەدی کە لە رووی هزرکردنەوە، خەڵك بەشداری لە کاروباری سیاسیدا بکات و تەنیا لەم چەشنە هەلومەرجەدایە کە خەڵك دەتوانن لە بە خوبەدەستەودان بە هەڵخەڵەتێنەرانی خۆ بپارێزن. بەم جۆرەش کۆمەڵگایەك کە بەسەر دوو گرووپی زۆرینەی هەژار و کەمینی دەوڵەمەند دابەشبووبێت، بەرەو دامەزراندنی جۆرە ئۆلیگارشی یا خود جۆرە حکوومەتێکی ستەمکارانە دەشکێتەوە. ئەم دوو جۆرە لە سیستەمی سیاسی کلاسیك هەنۆکەش لە هەندێ شوێندا بوونیان هەیە.

بۆ خوێندوەی عەینیانەی ئەم گریمانەیە هێماکانی گەشەسەندنی ئابووری وەك داهات، شارستانی، پەروەردە و بە پیشەسازی بوون رەچاو دەکرێت. هەر یەك لەم پێودانگانە لە سیستەمە کەم تازۆر دیموکراتیکەکان بەراورد دەکرێن.

بە گشتی تێکڕای رێژەی بە پیشەسازی بوون، شارستانی، داهات و پەروەردە لە ولاتە دیموکراتیکەکاندا، بە بەراورد لەگەڵ ولاتانیتر زۆرترە. بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت ولاتانی ئەمریکای لاتین و ئەوروپا پێکەوە لە خشتەیەکدا شیبکەینەوە جیاوازییەکی بەرچاو لە نێوان هێماکانی سەرەوەدا دەبینن.

هەندێ کەس پەروەردە بە فاکتەرێکی گرنگی پەرەسەندنی دیموکراسی دەزانن لە ولاتانی دیموکراتیکی ئەوروپادا رێژەی خوێندەواری ٨٥٪ و لە ولاتانی ئەمریکای لاتین لە دەیەکانی رابردوودا، رێژەی خوێندەواری لە دیکتاتۆری لاواز تا دیکتاتۆری بەهێز،





لە نێوان ٤٦٪ تا ٧٥٪ بوو. ڕێژەی ئەو کەسانەی کە لە ئاستە جیاوازەکانی سەرەتایی، ئامادەیی و زانکۆ ناو نووسیان کردبێت، دەتوانێ دەربڕی ئاستی دیموکراسی لە وڵاتاندا بێت.

پەیوەندی نێوان پەروەردە و دیموکراسی پێویستی بە قووڵ بوونەوەی هەیە، چونکە حکومەتە دیموکراتیکەکان، پەرەسەندنی پەروەردە لە مەرجە سەرەکییەکانی پەرەسەندنی دیموکراتی دەزانن. پەروەردە ئەم باشییەی هەیە کە سەرەڕای فراوانکردنی بۆچوونەکانی تاك، توانای پێویستی بۆ تێگەیشتن لە نۆرمگەلی پێکەوە ژیانی سیاسی پێی دەبەخشێت و مرۆڤ دەتوانن لە کاتی هەڵبژاردنی (شتێك) پشت بە لۆژێك ببەستن.

زانیارییە بەدەستهاتووەکان لە بنکەکانی هەڵسەنگاندنی ڕای گشتی پێویستی و گرنگی پەرەوەدە بۆ پەرەپێدان بە نۆرمە و دیموکراتیکەکان بە ڕوونی دەخاتەڕوو.

ئەم بنکانە لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا پرسیار لە مرۆڤ دەکەن و بۆچوونیان لە بارەی نۆرمە جوراوجۆرەکانی دیموکراسی وەك لێبوردەی سیاسی لە هەمبەر گرووپە بەرهەڵستکارەکان، بۆچوونیان سەبارەت بە کەمینەی نەژادی و کولتووری، بۆچونیان سەبارەت بە سیستەمە فرە پارتی و تاك پارتییەکان شیدەکەنەوە. ئەنجامی ئەم توێژینەوانە لە پێشوو زۆرتر جەخت لە گرنگی پەروەردە دەکەنەوە، ئەم توێژینەوانە ئەم خاڵە دەخەنەڕوو کە ئەو کەسانەی خاوەن خوێندەواری زۆرتر بڕوایان بە بەها دیموکراتییەکان هەیە و زۆرتر لە کەسانیتر پشتگیری لە بنەما دیموکراتیکەکان دەکەن و لە پراکتیکیشدا لە هەمبەر داهات و پیشە زۆرتر گرنگی بە پەروەردە دەدەن.

داتا ئامارییەکان نیشاندەدەن کە پەیوەندی پتەو لە نێوان ئاستی پەروەردە و چوونێتی جێبەجێ کردن و کار کردن کاروباری سیاسی هەیە، بەڵام لە پراکتیکدا نیشاندراوە کە ئەڵمانیا و فەڕەنسا سەرەڕای ئەوەی کە زۆرترین توێژی خوێندەوەی بە تەنیا نەیتوانی دیموکراسی لەم وڵاتانەدا سەقامگیر بکات.



بەهەر حال لایەنکەی کاریگەری پەروەردە ئەوەیە کە لە گەشەکردنی ڕەگەز و هێزە دژە دیموکراسییەکان پێشگیری دەکات سەبارەت بەم بابەتەش بینراوە کە پێویستە ئاسەواری جیاواز بەرچاو لە شێوازی ژیانی چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا لە ڕووی دەروونییەوە ڕەچاو بکرێت. گۆڕینی بارودۆخی چینایەتی جیاواز دەبێتە هۆی ئەوەی کە چینەکانی سەرەوە زۆرتر ڕەچاوی مافەسیاسییەکانی چینە خوارووەکان، بە تایبەتیش بەشدارکردنیان لە دابەشکردنی دەسەڵاتدا، بکەن.

لە هەلومەرجی جیاوازی چینایەتی، چینە سەرووەکان نەتەنیا بەرپەرچی بەها دیموکراتیکەکان دەدەنەوە، بەڵکو ڕەفتاری خۆ ویستانەی سیاسی ئەم چینە دەبێتە هۆی بەرپەرچدانەوە، نگەتیڤی چینە خوارەکانی کۆمەڵگا.

چۆنێتی دابەشکردنی داهاتی گشتی وڵاتێك کاریگەری زۆری بەسەر چۆنێتی ڕامان لە نۆرمگەی لێبوردەیی سیاسی و دیموکراسیدا هەیە. لەو ڕووەوە کە بە بۆچوونی هەندێ لە زانایانی سیاسەت بریتین لە: دابەشکردنی بەهاکان، بۆیە لە میانەی ئەم پرۆسەیەدا، بۆشایی بەرقەرار لە کۆمەڵگادا لەناو دەچێت. کاتێك کە کۆمەڵگا خاوەن ئیمکاناتی دارایی پێویست بێت، دەکرێ سامانیش دووبارە دابەشبکرێتەوە. کاتێك کە لە دەستدانی پلە بۆ گرووپە سەرەکییەکانی دەسەڵاتدار بە مەترسی هەژمار بکرێت، لەم کاتەدا ئەوان ئامادەن بۆ دووبارە بەدەستهێنانەوەی دەسەڵات سوود لە ئامرازی بەهێزتر وەربگرن. توانایی دارایی یارمەتی حکوومەت دەدات تا نۆرمە گشتی و ڕەوشتییەکان بەسەر فەرمانبەر و سیاسەتمەداراندا بسەپێنیت، بەچەشنێك کە سەرەڕای نەهێشتنی جۆرەکانی گەندەڵی کارگێڕی، فەرمانبەران بە پێی جێی شیاو بۆ کەسی شیاو دابمەزرێنیت. بە پەسەندکردنی نۆرمە ئاکارییەکان لەلایەن فەرمانبەرانەوە ڕێگە بۆ گەشەسەندنی بۆرۆکراسی کارامە کەئەمرۆ کە بە یەکێك لە مەرجەکانی دامەزراوەیەك کە دەتوانێ بە ناڕاستەخۆ لە هەموارکردنی دەسەڵات لە نێوان بەشداربوونی پرۆسەی سیاسیدا ڕۆڵ بگێڕێت.

دامەزراوەیەکی "ناوبژیوانە" کە توکویل و کەسانیتر بە تیۆری ((کۆمەڵگای کۆمەڵەی MOB)) ناوی دەبەن.

تیۆری ناوبراو ئاماژە بەوە دەکات کە کۆمەڵگەیەك ئەگەر دامەزراوەی تارادەیەك سەربەخۆ لە حکوومەتی ناوەندی نەبێت، خاوەن ئیمکاناتی شاراوەی دیکتاتۆرییە. کارکردی ئەم دامەزراوانە بۆ دیموکراسی زۆر پێویستن. ئەوان بەسەرچاوەی پووچەڵکردنەوەی دەسەڵات هەژماردەکرێن و لەدەست بەسەرداگرتنی گرووپە قۆرغکارەکان بەسەر سەرچاوە سیاسییەکاندا پێشگیری دەکەن. ئەم دامەزراوانە خاوەن بیرۆکەی نۆین و کەناڵی کۆکردنەوەی بۆچوونگەل و ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکانی کۆمەڵگان. ئەم دامەزراوانە سەرەڕای یارمەتیدانی پەروەردەی گشتی، تاکەکان بۆ بوون بە کادیری سیاسی پەروەردە دەکەن و یارمەتی خەڵك بۆ بەشداری بوون لە پرسە سیاسییەکان دەدەن. ئەگەرچی زانیاری دروست سەبارەت بە پەیوەندی نێوان نموونە نیشتمانییەکان بە رێکخراوە خۆبەخش و سیستەمە دەسەڵاتدارەکان لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا لەبەر دەست نییە، بەڵام لێکۆڵینەوەکانی هەڵسوکەوتی (سلوکیة) لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا نیشاندەدەن کە ئەو کەسانەی ئەندامی رێکخراوێکن، زۆرتر پارێزگاری لە نۆرمەکانی دیموکراسی (وەك لێبوردەی سیاسی) و سیستەمە فرە پارتییەکان دەکەن و زۆرتر لە کەسانیتر بەشداری لە پرۆسەی سیاسیدا، بە چەشنێك کە بۆ نموونە لە کاتی هەڵبژاردندا زۆرتر چالاکن. بۆیە تێبینی دەکرێ ئەو وڵاتانەی کە سیستەمی پەروەردەی باشتریان هەیە، رەچاوی دامەزراوە خۆبەخشەکان دەکەن و دەتوانن بە بەشێك لە کارکردن باشی کۆمەڵگا هەژمار بکرێن، چونکە بوونی بارودۆخی باشی ئابووری، لە پەرەپێدانی ئەم جۆرە رێکخراوانە ئاسانکاری بکات. بە بۆچوونی زۆرێك لە زانایان وەك ماکس ڤێبر فاکتەرەکانی پەرەسەندی دیموکراسی لە وڵاتانی پێشکەوتووی ئەورووپادا هەڵقوڵاوی بەردەوامی مێژوویيە کە دامەزراندنی سێستەمێکی ئاڵۆزی سەرمایەداری لەم ناوچەیەدا لێی کەوتووەتەوە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە گەشەسەندنی ئابووری سەرمایەداری لە وڵاتانی پرۆتستانتدا خێراتر



بوو. بە بڕوای ڤێبر جەختکردنەوەی بنەماکانی پرۆتستانیتزم لەسەر بەرپرسیارێتی تاکەکەس، سەرهەڵدانی بەها دیموکراتیکەکانی لێکەوتەوە. بەم جۆرەش دەبینرێ کە تێکەڵبوونی فاکتەرگەلی جۆراوجۆری وەك پرۆتستانتیزم. حکوومەتی خەڵك سالاری، وەرچەخانی لەسەرخۆی سیاسی، بۆرژوازی و مەشروعییەت و دیموکراسی بوون بە هۆی گەشەسەندنی ئابووری لە ئەورووپادا.

**مەشروعییەت و کاریگەر بوون:**

لە جیهانی ئەمڕۆدا، گەشەی ئابووری، بە پیشەسازی بوون، شارنشینی، بەرزی ئاستی پەروەردە و زیاد بوونی تەربیانەی داهاتی گشتی لە خۆ دەگرێت کە زەمینەی سەرەکی بۆ دیموکراسی و کارایی سیستەم فەراهەمدەکات. بەڵام سەقامگیری سیستەمی دیموکراتیك تەنیا بەند نییە بە کارایی سیستەم لە قۆناغی نوێگەری کۆمەڵگادا، بەڵکو بە مەشروعییەت و کاریگەر بوونی سیستەمی سیاسیش بەندە. مەبەست لە کاریگەری بوون، کارامەیی راستەقینەی سیستەمی سیاسییە، بە چەشنێك کە کارکردی سەرەکی حکوومەت بە ئاراستەی دابینکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا بێت. کاریگەر بوونی سیستەمێکی سیاسی دیموکراتیك بە پێی بۆرۆکراسی و سیستەمی بڕیاردانی کارامە کە بتوانێت تەنگ و چەلەمەکانی سیاسی چارەسەر بکات، هەڵدەسنگێندرێت، هەڵبەت پێویستە کاریگەر بوونی ئەم دامەزراوانە، لە کارامەیی گشت سیستەمی سیاسی جیا بکرێتەوە. زیاد لەمەش، پێویستە ئاماژە بدرێت کە هەر جۆرە ناکۆکییەك لە کارکردەکانی کۆمەڵگادا، بە گشتی، بەسەر سیستەمە لاوەکییەکانی (SUB-SYSTE) سیاسی کاریگەری دەنوێن.

مەشروعییەت بە مانای توانایی سیستەمی سیاسی بۆ دروستکردن و پاراستنی ئەم بنەمایە دێت کە دامەزراوە سیاسییەکانی بەرقەرار لە کۆمەڵگادا بە باشی کاردەکەن و دامەزراندنی ئەم دامەزراوانە بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگایە. مەشروعییەتی سیستەمە سیاسییەکانی هاوچەرخ زۆرتر پشت بەستراوە

به سەرکەوتنیان لە یەکلایی کردنەوەی ناکۆکییەکانی ناوخۆی سیستەمەکان و نەهێشتنی ناکۆکی لە کۆمەڵگادا. لێرەدا، سەرەتا پێویستە نیشانبدەین کە چۆن ئەگەری ئەوە هەیە کە مەشروعییەتی سیستەمی سیاسی، کاریگەری بەسەر تواناکانی بۆ دەرباز بوون لە قەیرانگەلی وەك وەستانی ئابووری یاخود شکست لە شەڕدا بنوێنێت. دواتر پێویستە پەیوەندی نێوان لەرزۆکی سیاسی و مەشروعییەتی سیستەمە جۆراوجۆرەکان بەراورد بکەین و ئاستی کاریگەری ئەم فاکتەرانە بەسەر بەهێز کردن و لاوازکردنی دیموکراسی هەڵبسەنگێنین. گرووپگەلێك کە لە ژێر کاریگەری سیستەمێکی سیاسیدان، بە پێی گونجان یا خود نەگونجانی سیستەمی بەهاکانیان لەگەڵ سیستەمی بەهای بەرقەرار، ئەم سیستەمە بە مەشروع یا خود نامەشروع لەقەڵەم دەدەن.

هەندێ جار مومکینە مەشروعییەت لەگەڵ زۆرێك لە شێوازەکانی رێکخراوە سیاسییەکان پەیوەندی هەبێت. کۆمەڵگا فیودالییەکانی پێش قۆناغی پیشەسازیی پشت بەستراو بە وەفادارای ئەندامانیان بوون. قەیرانە دژ بەیەکەکانی هەڵقولاوی وەرچەرخانی سەردەمی تەکنۆلۆژین کە بە هۆی بوونی سەرچاوەکانی راگەیاندن لە دوای قووڵ بوونی ناکۆکی لە نێوان گرووپە دژبەیەکەکان سەریانهەڵداوە لەئەنجامدا بەهاگەلێك کە سەردەمێك هۆی مەشروعییەت بوون، بوون بە هۆی نامەشروعییەت بوونی گشت سیستەم. لەراستیدا دەکرێ بڵێین، قەیرانی مەشروعییەت، قەیرانی گۆڕان و وەرچەرخانە. بەم پێیەش، ئاسەوارەکانی دەتوانێت بەسەر سەقامگیریی سیستەمە دیموکراتییەکاندا کاریگەریی هەبێت. هەر بۆیەش پێویستە بەدوای ریشەکانی ئەم قەیرانە لە چۆنێتی گۆڕان و وەرچەخانی کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا بگەڕێین. فاکتەرگەلێك کە لە قۆناغی گواستنەوەدا، دەبنە هۆی قەیرانی مەشروعییەت، بریتین لە:

١- گشت گرووپە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا کە لە قۆناغی گواستنەوەدا دەستیان بە سیستەمی سیاسی نوێ نەگەیشتووە یاخود لە کاتی دەستپێکردنی ئەم قۆناغە



داواکارییە سیاسییەکانیان بکەن. بەڵگە نەویستە کە سیستەمی سیاسی نۆی ناتوانێت لە هەمان کاتدا وەڵامدەرەوەی پێداویستییەکانی ئەم گرووپانە بێت کە خودی ئەمەش خێراتر قەیرانی مەشروعییەتی لێدەکەوێتەوە.

٢- مومکینە پێگەی هەندێ لە دامەزراوە پارێزگارەکان لە قۆناغی وەرچەخانی ستراکتۆریدا رووبەڕووی هەڕەشە ببنەوە ئەگەر بێتو دوای دامەزراندنی ستراکتۆرێکی نۆیی کۆمەڵایەتی، سیستەمی نوێ لە قوناغێکی دوور و درێژدا نەتوانێت پێداویستییەکانی گرووپە سەرەکییەکان، لەم چوارچێوەی ستراکتۆر و بەها نوییەکاندا، دابینبکات، سیستەم رووبەڕووی قەیرانی مەشروعییەت دەبێتەوە. توکویل بە ئاماژە پێکردن بە هەرەسهێنانی سیستەمەکانی پاشایی ئێروستۆکراتی و گۆڕینیان بە سیستەمە دیموکراتییەکان، وێنایەکی گشتی لە قەیرانی مەشروعییەت دەخاتەڕوو و وەها بۆی دەچێت کە بە درێژایی مێژوو رووداوگەلێك لە ژیانی نەتەوەکاندا روو دەدەن کە لەمیانەیدا داب و نەریتی کۆن گۆڕانیان بەسەردا دێت و بوێری گشتی لەناو دەچێت و بروا ئایینییەکان لەرزۆك دەبن و لە ئەنجامدا نەریتە کۆنەکان دەپووکێنەوە.

ئەو نەتەوانەی کە لە قۆناغی ئۆلیگارشی و رەهاگەرایی بەرەو دامەزراندی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی دیموکراتیك لە بزاڤدان، سەرەڕای ئەوەی کە مەشروعییەتی دامەزراوە سیاسییەکانیان پاراستووە، بەپێی ئەم مەشروعییەتە توانای گۆڕان و وەرچەخان لە ناوخۆیاندا هەیە. سەلمێنراوە کە ئەگەرچی لە رووکەشدا پاراستنی حکوومەتی پاشایەتی دەبێتە هۆی پاراستنی ئۆرۆستوکراتیەت و سوننەتگەرایی، بەڵام وێناگەلی خەڵك سالاری و یەکسانی خوازیی رووبەرووی ناکاریی دەکاتەوە.

٣- هۆیەکیتری هەرەسهێنانی مەشروعییەت، سەرهەڵدانی گرووپی نوێ و دەست گەیشتنیان بە پرۆسەی سیاسییە کە دەتوانێت کاریگەریی بەسەر مەشروعییەتی سیاسیدا هەبێت. لەم رێڕەوەدا گرووپە پارێزگار و تازە سەرهەڵداوەکان رۆڵی گرنگ لە سیستەمی سیاسیدا دەگێڕن. لە سەدەی نوزدەیەمدا زۆرینەی ئەندامانی ئەم گرووپە تازە سەرهەڵداوانە، کرێکارە پیشەسازییەکان بوون کە بەهاتنە ناوەوەیان بۆ پرۆسەی





سیاسی، مەشروعییەتی سیستەمیان گۆڕی. قەیرانی سەدەی بیستەم پێکدادانی نوخبەکانی کۆلۆنیامکار و جووتیارانی بەدواوە بوو. کاتێك کە گرووپە نوێیەکان لەڕووی سیاسییەوە کارا بوون (بۆ نموونە کاتێك کە کرێکاران لە ڕێگەی دامەزراوە ئابوورییەکان و سوود وەرگرتن لە دەنگەکانیان هەوڵی بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری دەدەن یاخود کاتێك کە بۆرژوازی هەوڵی بەشداریی لە حکوومەتدا دەدات، یا خود کاتێك کە نوخبەی کۆلۆنەکان هەوڵی کونترۆڵ کردنی سیستەم دەدەن)، دامەزراوە سیاسییەکانی مەشروع هەوڵی بەدەستهێنانی وەفاداری و پشتگیری گرووپە تازە سەرهەڵداوەکان دەدەن. لەگەڵ ئەمەشدا خودی ئەم گرووپانە یارمەتی چینە باڵا دەست و زاڵە سوننەتییەکان دەدەن تا پێگەکانی دەسەڵات دارێژران ئەم سنووردارێتییە گۆڕینی بارودۆخی بۆرژوازی و کرێکارانی لە خۆ دەگرت. لە ئەڵمانیادا گۆڕینی کۆمەڵگا لە فیۆدالیزمەوە بۆ بۆرژوازی بە پێی هاوپەیمانی نێوان ئۆرستیۆکرات و بۆرژوا ڕوویدا. تەنانەت هەندێ جار حکوومەت بۆ جێبەجی کردنی ئەم سنووردارێتییە هێزی بەکارهێنا. ئەم کردارانەش خۆ دوورخستنەوەی گرووپە نوێیەکان لە پرۆسەی سیاسیدا لێکەوتەوە و لە قۆناغەکانی دواتردا ناچار بوون پشت بە ئایدیۆلۆژیای توندڕەو ببەستن و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لە درێژخایەندا زۆرێك لە توێژەکانی کۆمەڵگا، بزاڤە کریکارییەکان دوور بکەنەوە و ئەم بزاڤانە لە پرۆسەی کۆمەڵایەتی دوور کەوتنەوە.

هەندێ لە سیستەمە سیاسییەکان کە لە گەیشتنی چینە نوێیەکان بۆ دەسەڵات پیشتگیری دەکەن، هەوڵدەدەن بۆ پەرەپێدان بە گەشەسەندنی سیاسی، بە بەڵێن دان سەرقالیان بکەن ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوان بە تاکە ڕێگەی گەیشتن بە دەسەڵات، واتە شۆڕش، پشت ببەستن. گرووپگەلێك کە ناچارن بۆ چوونە ناوەوەی پرۆسەی سیاسی هێز بەکار بێنن، هەوڵدەدەن گرنگی بەشدار بوونی سیاسییەکەیان لە ڕادەبەدر زەقبکەنەوە. لەم چەشنە بارودۆخەدا ڕژێم لە لایەن دوو گرووپەوە دەخرێتە ژێر گوشاردا: یەکەم گرووپگەلێکن کە سەرەڕای پاراستنی وەفادار بوونیان بە ڕژێمی



پێشوو، وەك سیستەمێکی نامەشروع دەڕواننە ڕژێمی نوێ، گرووپی دووەم کەسانێکن کە بە گۆڕێنی ڕژێم ئاواتیان بە ڕژێم شکست دێنیت و بۆیەش سیستەمی سیاسی بە نامەشروعییەت هەژمار دەکەن.

لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو زۆریك لە دەوڵاتانی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووی ئاسیا و ئەفریقا بە بەدەستهێنانی وەفاداری خەڵك، دەیانتوانی بەشێك لە خواستە ئایدیالەکانی ئەم خەڵکە لە ڕێگەی بزاڤی نەتەوایەتی قۆناغی کۆلۆنیال کە سەربەخۆیی ئەم وڵاتانەی لێکەوتەوە، دابینبکات و لەم ڕێگەیەشەوە مەشروعییەت بەدەستبهێنن.

لەم باسە ئاماژە بە ڕێگەی جۆراوجۆرەکانی بەدەستهێنانی مەشروعییەتی سیاسیکرا. سەرەڕای کاریگەر بوونی شێوازەکانی بەدەستهێنانی مەشروعییەت، کاتێك کە پێگەی کۆمەڵایەتی گرووپە پارێزەگارەکان (**محافظین**) ڕووبەڕووی گۆڕان ببێتەوە، یا خود لە قۆناغێکی دیاریکراودا دەست گەیشتنی ئەم گرووپانە بە پێگەی دەسەڵات ئاستەم بێت، مەشروعەکانیشدا، ئەگەر بێتو گرفتێك لە کاریگەر بووندا (لە قۆناغێکی دیاریکراو و چەندین جار) ڕوودبات، لەوانە سەقامگیری سیستەمی سیاسی تووشی مەترسی ببێتەوە. پەرەسەندنی کولتووری سیاسی و ڕێزگرتن لە سیمبولە نەتەوەیی و ئایینییەکان دەتوانێت یارمەتیدەری پاراستنی مەشروعییەت و بەهێزکردنی کارکردە دیموکراتیکییەکان بێت. لە هەندی وڵاتانی ئەوروپادا باڵی ڕاست و چەپ خاوەن زنجیرە هێما گەلی تایبەت بە خۆیانن، هەر یەکیان سیاسی و مێژوویی تایبەتیان هەیە. فەڕەنسا یەکێك لەو وڵاتانەیە کە نەیتوانیوە پەرە بەم میراتە هاوبەشە بۆبەدەست هێنانی مەشروعییەت بدات. هەر بۆیەش لە ساڵی ١٧٨٩وە تا سەدەی نۆزدەیەم مشتومڕی زۆر لە نێوان باڵەکانی ڕاست و چەپ بۆ بەکارهێنانی هێماگەلی جۆراوجۆر لەم وڵاتەدا بوونی هەبوو و تا هەنۆکەش ئەم پرسە هەر بەردەوامە. زۆر جار مشتومڕی سیاسی گەورەی لە نێوان ڕاست و چەپدا دروستکردووە، بە چەشنێك کە لە ڕووی مێژووییەوە ناکۆکی نێوان ڕەگەزی ئایینی و





دژە ئایینی، پێشکەوتوو خواز و کۆنەپارێز (مرتجع) گرفتی زۆری خولقاندووە. بە گشتی ئەم پرسانە لەرزۆك بوونی مەشروعییەتی سیستەمی سیاسی فەرەنسای لێکەوتووەتەوە.

رادەی مەشروعییەتی دامەزراوە سیاسییەکان لە روانگەی چینە جۆراوجۆرەکانەوە جیاوازە. هەبوونی زانیاری لەسەر رادەی مەشروعییەتی دامەزراوە سیاسییەکانی ولاّتان، فاکتەرێکی گرنگە بۆ شیکردنەوەی رادەی سەقامگیریی ئەم دامەزراوانە لە کاتی رووبەڕوو بوونەوەیان لە قەیرانەکان.

لێرەدا دەردەکەوێت کە باسی پێشوو سەبارەت بە پەیوەندی نێوان گەشەی ئابووری و دیموکراسی لەگەڵ مەشروعییەتدا پەیوەندییان هەیە. لە راستیدا، لە جیهانی ئەمڕۆکە کاریگەر بوون (کە بەردەوام بوونی مەشروعییەت بە سیستەمی سیاسی دەبەخشێت) بە واتای گەشەسەندنی ئابووری دێت. ئەو ولاّتانەی کە لە گشت هۆیەکانی خۆشگوزەرانی بەهرەمەندن و لە ناکۆکی سیاسی ناوخۆیی بە دوورن و بە پاراستنی نەریتەکانی کۆن هەوڵی پەرەپێدان بە هێماگەلی نوێ و بەهێز دەدەن، دەتوانن ئاستی مەشروعییەتەکەیان لە ئاستێکی بەرزدا راگرن.

لە زۆرێك لە ولاّتانی گەشەسەندووی ئەمریکای لاتین، ئاسیا و ئەفریقیا، بارودۆخ بەم جۆرە نییە. بۆ نموونە، ستراکتۆریی کۆمەلاّیەتی- ئابووری ولاّتانی ئەمریکای لاتین بە چەشنێکە کە بە دەگمەن حکوومەتەکان توانیویانە بۆ پەرەپێدان بە مەشرووعییەتەکەیان هێماگەلی نوێ بخولقێنن. سەبارەت بە دیموکراسییە تازە سەرهەڵداوەکانی ئەفریقیا و ئاسیا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە ریڕەوی گەشەسەندنی سیاسی ئەم ولاّتانە بە رێژەی کارامەیی ئەم ولاّتانە لە دابینکردنی پێداویستی هاوولاّتییەکانیانەوە بەندە. مەشروعییەت بۆشایی سیاسی.

بە پێی کاریگەر بوونی کارکردی سێیەم و ئەو مەشروعییەتەی کە سیستەمی سیاسی بۆی هەوڵدەدات، ئەگەری ئەوە هەیە کە مەترسی بەردەوام وەك زیاد کردنی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی سیستەم، مەشروعییەتەکەی لەرزۆك بکات. بوونی ناکۆکییە



ناوخۆییەکان بە رێژەیەکی مامناوەندی، یەکێك لە لایەنە سروشتییەکانی سیستەمی دیموکراتیك و مەشروعە. بەهەمان رادەش، لە کاتی زیاد بوونی ئەم ناکۆکییانە لە نێوان گرووپە دژ بەیەکەکاندا، ئەگەر بێتو سیستەمی سیاسی نەتوانێت چارەسەریان بکات، ئەم بارودۆخە کاریگەری لەسەر رادەی مەشروعییەت بوون دادەنێت و هێماگەلی نوێ دروستدەکات.

لە سەدەی بیستەمدا، ولاّتانی رۆژئاوا رووبەڕووی سێ پرسی سەرەکی ببوونەوە:

یەکەم. پرسی ئایین بوو کە پەیوەست بوو بە دیارکردنی پێگەی کەنیسە لە کۆمەڵگادا و پەسەندکردنی ئایینە جۆراوجۆرەکان. پرسی دووەم، رێگەدان بە چینەکانی خوارروو بەتایبەتیش کرێکاران، لە سیاسەت و بەشداری کردنیان لە دەسەلاّتدا لە رێگەی مافی بەشدار بوون لە هەڵبژاردنەکان و خاوەن پێگە بوون لە جەمسەرە ئابوورییەکاندا (یەکێتی کرێکاران). سێیەمین پرس، مشتومڕ لەسەر دابەشکردنی داهاتی نەتەوەیی بوو.

لێرەدا ئەم پرسیارە گەلاّڵە دەبێت کە ئایا ولاّتانی رۆژئاوا بە جیاواز هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەم پرسانەدا کرد و کاتێك کە پرسەکیان چارەسەرکرد، دواتر پرسێکیتریان گەلاّڵە کرد، ئایا پرسگەلی مێژوویی و فاکتەری دروستکەری ناکۆکی و بۆشایی لە کۆمەڵگادا تێکەل بە پرسە نوێییەکان دەکرێن و لە تێکەل بە یەکتر کردنیان پرسگەلی نوێ دروستدەبن؟ بە گشتی زۆر جار، چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان سەقامگیری و مەشروعییەتی لێدەکەوێتەوە، خەڵك و پارتەکان بە هۆی ناکۆکی ئایدیۆلۆژیکی، نەك بە هۆی پرسە بەرقرارەکان، دژ بە یەکتر دەوەستنەوە. لەم رێڕەوەدا، ئەوان سەرکەوتنی نەیارەکانیان بە مەترسییەکی جیددی بەسەر بەها گشتییەکانی رەوشت دەزانن. بە گشتی ئەم دژ بەیەك وەستانە دەتوانێت یەکپارچەیی کاریگەریی بوونی سیستەم لەرزۆك بکات، پرسە ئایینییەکان کە زۆرتر بە پێگەی کەنیسە لە کۆمەڵگادا پەیوەستە و لە دوو سەدەی رابردوودا چارەسەر کران، هەنوکە لە زۆرێك لە ولاّتانی پرۆتستانتدا پرسێکی فەرامۆشکراوە، لە هەندێ ولاّتی وەك





بەریتانیا، وڵاتانی ئیسکاندیناڤیا و سویسرا کەنیسەکانی دەوڵەتی وەکو حکوومەتی مەرجداری پاشایی پێگەی خۆیان پاراستووە و لە هەمان کاتدا، دەوڵەت پێشگیری لە ئاسەوارە ئایینییەکان دەکات. لە نێوان وڵاتانی کاسۆلیکی ئەوروپادا، هەندێ لە پرسگەی ئایینی کە لەرابردووی دووردا گرنگییان هەبوو، دواجار لە شۆڕشی ١٧٨٩ی فەڕەنسا، مشتومڕ لە نێوان گرووپە ئایینی و نائایینییەکان دەستیپێکرد کە ئەنجامەکەی بۆشایی تێکەوتن لە نێوان گرووپە جۆراوجۆرەکاندا بوو کە لێکترازانی لێکەوتەوە. هەروەك چون لە وڵاتگەلی وەك فەڕەنسا، ئیتالیا، ئیسپانیا و نەمسا، کاسۆلیك بوون بەمانای یەك بوون لەگەڵ گرووپە راستییەکان و پارێزگار لە سیاسەتدا هەژمار دەکرێت، لە کاتێکدا کە دژە ئایین بوون (یان سەربە ئایینی کەمینە بوون) بە مانای هاوکاریی و یەکبوون لەگەڵ گرووپە چەپییەکان هەژمار دەکرێت.

لە هەندێ لە وڵاتانی ئەوروپادا بەسەرهەڵدانی پرسگەی نوێ، بابەتە ئایینییەکان فەراموش کران. لە روانگەی کاسۆلیکەکانی پارێزگار، شەڕ دژی سۆسیالیستەکان تەنیا مشتومڕێکی ئابووری بەسەر دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان نەبوو، ئەوان ئەم جۆرە ناکۆکییانە هەڵقوڵاوی ناکۆکی نێوان خوا و ئەهریمن، چاك و خراپ دەزانی. لە روانگەی زۆرێك لە زانا سکۆلاریستەکانی ئیتالیا دژی کەنیسە وەستان بە مەشروعییەت بەخشین بە یەکبوون لەگەڵ کۆمۆنیستەکان هەژمار کراوە. بەڵگەنەویستە، هەر ئەندازە پابەندی و فاکتەری ئایینی، هەرەشە لە یەکپارچەیی سیاسی بکات، تواناییەکانی بەردەست بۆ سازش و دانوساندنی دیموکراتیك زۆر لاواز دەبێت.

بوونی مافی یەکسانی بۆ تاکەکان بۆشای کۆمەڵایەتی پڕ دەکاتەوە و دواجار یارمەتیدەری دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراتیکی سەقامگیرە. ئەمریکا و بەریتانیا لە سەرەتا و ناوڕاستەکانی سەدەی نوزدەیەم ئیمتیازی هاووڵاتی بوونی بە کرێکاران بەخشی، لە کاتێکدا کە وڵاتانی وەك سوید و وڵاتانیتری ئەوروپا، بۆ بەخشینی ئەم مافە تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەرگرییان کرد و بەدەستهێنانی مافی سیاسی تیکەڵ بۆ سۆسیالیزم بوو و بزاڤە شۆڕشگێڕییەکانی لێکەوتەوە.



بەواتایەکیتر، لەو ناوچانەی کەدان بە مافی هاووڵاتی بوونی کرێکاران نەدەدرا، هەوڵدانەکانیان بۆ دووبارە دابەش بوونی سامان و بەها کۆمەڵایەتییەکان بارێکی قورسی لە ئەستۆی ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕ دادەنا. کاتێك کە ئەم مشتومڕە بۆ بەدەستهێنانی مافی کۆمەڵایەتی و ئابووری کرێکاران لە دەرەوەی ئەم کەش و هەوایەدا روویدەدا، ئایدیۆلۆژیا وەك جۆرە چاکسازییەکی لەسەرخۆ بەرجەستە دەبوو. بۆ نموونە لەسەردەمی دەسەڵاتداریێتی بنەماڵەی ((هوهن زۆلرن)) لە ئەلمانیادا، کرێکاران تا شۆڕشی ساڵی ١٩١٨ لە هەبوونی مافی دەنگدان و ئازادی لە ئیمپراتوری پرۆسەدا بێبەش بوون. ئەمەش بارودۆخی بۆ پەرەسەندنی مارکنیزم لە هەندێ ناوچەی ئەلمانیا کە کرێکاران تیایدا خاوەن مافی سیاسی نەبوون، فەراهەم کرد. بەڵام لە بەشی باشووری ئەلمانیادا، واتە ناوچەیەك کە لە سەردەمی نۆزدەیەمدا مافی هاووڵاتی بوونی کرێکاران بەخشرا، چاکسازی و سۆشیالیزمی ناشۆڕشگێڕی و دیمکراتیك تیایدا بەرقەرار کرا، زیادبوونی دۆگمە شۆڕش خوازییەکان لە پارتی سۆشیال دیموکراتدا بووبە هۆی ئەوەی کە تاقمە توندرەوەکانی چەپ دەنگی خۆیان بەسەرۆکی پارت بگەیێنن، بەم جۆرەش کۆمۆنیستەکان توانییان پاش شکستی سەربازی و مێژوویی بەهێز ببنەوە و بەشێکی گەورەی چینە مامناوەندییەکانی ئەلمانیا تووشی دڵەراوکێ بکەن، هەڵبەت پێویستە وەبیر بهێنینەوە کە هۆی ترس و دڵەراوکێ چینی ناوڕاست لە ئەگەری سەرکەوتنی سۆشیالیستەکان، ترس لە نەمانی مافە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانیان بوو. لە فەڕەنسادا کرێکاران مافی دەنگدانیان بەدەستهێنا. بەڵام مافە سەرەتاییەکانی ئابووری ئەم چینە تا دوای شەڕی دووەمی جیهانی دانی پێنەنرا. زۆرێك لە خاوەن کارەکانی فەڕەنسا دوای سەرکەوتنی یەکێتی کرێکارییەکانی ئەم وڵاتە، سەرەڕای لاواز بوونی ئەم یەکێتییانە، مەشروعییەتیان بەم دامەزراوانە نەبەخشی. ئەم پاکسازییانە بووبە هۆی رووکردنی کرێکاران بە تاقمە سیاسییە توندرەو و شۆڕشگێڕییەکان. پێویستە دەستڕۆیی کۆمۆنیستەکان لە بزاڤە کرێکارییەکانی فەڕەنسادا لە تاکتیکەکانی بە کارهاتوو و لە هەروزییەکاندا بدۆزیتەوە.





هیچ یەك لەم بابەتانەی باسکران پاساونین بۆ ڕێگە هەلبژێردراوەکان لە لایەن حکوومەتەوە بۆ بەرقەرارکردنی یەکپارچەیی نیشتیمانی. بۆیە پێویستە پەیوەندی نێوان بۆشاییە سیاسییەکانی بەرقەرار لەگەڵ حکوومەتگەلێك کە خوازیاری سیستەمێکی سەقامگیر و دیموکراتیکن، خوێندنەوەی بۆ بکرێت. لەو بابەتانەدا کە بۆشایی سیاسی بەرقەرارە دامەزراندنی بناغەگەلی سیاسەتی ئایدیۆلۆژیکی لێدەکەوێتەوە، دیموکراسی بەرەو لاوازی و ناسەقامگیری هەنگاو دەنێت، بە پێی پێناسەکانی باسکراو، ئەم جۆرە تێگەیشتنە سیاسییە، ناتوانێت ببێت بە پاساوی لیبوردەی سیاسی.

سیاسەتە ئایدیۆلۆژیکییەکان لاواز بوونی دیموکراسییە سەقامگیرەکانی لێدەکەوێتەوە، ئەو پارتانەی کە خاوەن خەسڵەتی ئایدیۆلۆژیکی تایبەت بە خۆیانن، هەوڵی بۆ دروستکردنی ژینگەییێك دەدەن کە ((ژیگموند نیەمان)) بە((پانتایی یەککگر)) ناوی دەبات. بە چەشنێك کە ئەم ژیانی ئەندامانی پارت و ئایدیۆلۆژیا و کارکردیان دەخاتە ژێر کونترۆڵی خۆیدا. بە هاتنەوەی ئەم جۆرە پانتایە، پارت هەوڵدەدات لایەنگرانی بە دەست گەیشتن و پەیوەندیکردن بە وێناکانی جیهانی دەرەوە کە لەلایەن بەرهەڵستکارانی ئایدیۆلۆژیای پارت، بانگەشەی بۆ دەکرێت، دوور بخاتەوە. نیومان لێك جیا کردنەوەی پارتگەلێك کە دەبێتە هۆی بەهێز بوونی دیموکراسی و ئەو پارتانەی کە لاوازی و ناسەقامگیری دیموکراسییان لێدەکەوێتەوە، بە پێویست دەزانین. ئەو پارتانەی کە لە زۆربەی وڵاتانی ئینگلیزی زمان و ئیسکاندناڤیا بوونیان هەبووە وە هەروەها پارتە پارێزگار و ناوەندگەراکان (بەرێز پەرکردنی پارتە ئایینییەکان) زۆرتر لە سەدەی هەڵبژاردنەکاندا چالاك بوونە، بەڵام پارتە ئایدیۆلۆژییەکان کەخاوەن جیهان بینییەکی تایبەتن، نەچوونەتە ناو ئاڵوگۆڕە سیاسییەکاندا و ناکۆکی ئایین و سیاسییان بە ناکۆکی لە نێوان واقیعییەتە مێژووییەکان لە لایەك و هەڵە بونیادییەکان لە لایەکیترەوە هەژمار کردووە، بخاتەوە و دامەزراندنی هەر جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ جیهانی دەرەوە کە مومکین بوو زیان بە



بیروبۆچوونی لایەنگرانی بگەینێت، خۆی دوور خستەوە. کاسۆلیك و سۆشیالیستەکان وەك دوو گرووپی سەرەکی ناتۆتالیتار پەیڕەوییان لەم جۆرە بڕیارانە دەکرد، بە جۆرێك لە زۆرێك لە ناوچەکانی ئەوروپا تاپێش ساڵی ١٩٣٩، کاسۆلیك و سۆشیالیستەکان لە میانەی دامەزراندنی تۆڕێکی پەیوەندی لە نێوان کەنیسە و پارت و دامەزراوە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، کە لایەنگرانیان زۆربەی کاتی خۆیان تیایدا بە سەر دەبرد، هەوڵیان بۆ پەرەپێدانی پەیوەندی نێوان چینە جۆراوجۆرەکان و توێژە ئایینییەکاندا باشترین نموونە نەمسایە کەتیایدا دوو گرووپی سۆشیال کاسۆلیك و سۆشیال دیموکراتەکان، وڵاتیان بۆ سەر دوو بلۆکی دژ بەیەك دابەشکردبوو و دووبەرەکی و ئاژاوەیان لە وڵاتدا دروستکردبوو، بەچەشنێك کە زۆربەی چالاکییەکانیان کاتێك گشت توێژەکانی کۆمەڵگا یەککگرتووبن، ڕیگەی گەیشتن بە دیموکراسی سەقامگیر ئاسانتر دەبێت. هەروەك ((رابرت دال)) و ((تالکوت پارسونز)) بۆی دەچن، ئەم جۆرە تاقمانە هەمیشە دژ بە مافی کەمینە سیاسییەکان دەوەستنەوە. بەڵگەنەویستە کە بۆ دامەزراندنی سیستەمی دیموکراسی سەقامگیر، بوونی حکوومەتێکی میانڕەو لە نێوان گرووپە سیاسییە رکابەرەکاندا پێویستە و میانڕەوی سیاسیش تەنیا لە ڕێگەی توانای سیستەمی سیاسی لە چارەسەر کردنی ناکۆکییەکان، پێش سەرهەڵدانی پرسگەلی نوێی مەترسیدار، بەدیدێت، زیاد لەمەش، بە هۆی کارتێکەری دوو لایەنی ناکۆکییە ئایینی یاسایی، سیاسی و سەندیکاییەکان و سەرهەڵدانی شەڕی چریکی، سیستەمی سیاسی بەرەو هەرەسهێنان دەچێت هەر چەند بۆشایی سیاسی قووڵتر بێتو سەرچاوەکانی گوشاریش بەرەو زیاد بوون بڕوات، ئەگەری گەشەسەندن کەمتر دەبێتەوە. هەروەها پەرەسەندنی بزوێنەرە سیاسییەکانی دژ بەیەك دەبێتە هۆی مەیلدار بوونی تاك و گرووپەکان بەرەو جەمسەرە توندڕەوەکان، هەر دوو فاکتەر، یەکێکیان لە ئاست پرسە چریکییەکان و ئەویتریش بە ئاراستەی پشتگیری کردنی پارت هەوڵدەدەن لایەنگرەکانیان لە پەیوەندی کردن بە گرووپە نەیارەکان دوور بخەنەوە و گرووپەکان گۆشەگیر و لە پرۆسەی سیاسی دوور بخەنەوە.





**ئەنجام:**

گرنگترین پرس لەبارەی دۆزینەوەی زەمینە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵك سالاری، ئاگادار بوون لە هەلومەرجی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییە کە پێویستە وەك سیستەمێکی لاوەکی (SUB-SYSTEM) لە گشت سیستەمدا، خوێندنەوەی بۆ بکرێت. بێگومان تاقیکردنەوەکان بە هۆی بەردەست نەبوونی زانیاری لە گشت بگۆڕەکان، دوور لە هەڵە نین.

بە هەر حاڵ زانیارییەکانی بەردەست، زنجیرە پەیوەندییەکی لۆژیکی بۆمان دەخەنەڕوو، بە جۆریك کە دەتوانین لە ڕێگەی ئەم کەرەستە خاوانە گریمانەی ئەرستۆ سەبارەت بە پەیوەندی نێوان شێوازە سیاسییەکانی حکوومەت و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، کە بۆ سەردەمی ئیمەش شیاوە، نیشانبدەین.

هەڵبەت ئەم هەڵنجێنانە، ناتوانێت ئاواتی لیبراڵە خۆشبینەکان سەبارەت بەوەی کە دامەزراندنی دیموکراسی سەقامگیر، بە بەرۆ بوونەوەی داهاتی گشتی، پەرەسەندنی پەروەردە و زۆرێك فاکتەریتر، پەیوەستە، بێنێتەدی. ((ماکس ڤێبر)) سەرەڕای باسکردن لە ئەگەری هەبوونی دیموکراسی لە رووسیای سەدەی بیستەمدا دەڵێت: ((بە پەرەسەندنی کولتووری رۆژئاوایی و ئابووری سەرمایەداریی، لە راستیدا ناتوانین گەرەنتی بکەین کە نیاز بە ئازادی لە رووسیا، پەیوەستە بە بوونی ئازادی گەلێك کە لە مێژووی ئەوروپادا بوونیان هەبووە... ئازادی لە ئەوروپادا بە پێی بارودوخێکی تایبەت بە بوون هات، کە دەکرێ دووبارە نەبێتەوە)).

لەوانەیە بۆچوونەکانی ماکس ڤێبر دروست بن، بەڵام پێویستە سەبارەت بە دامەزراندنی خەڵك سالاری لە ناوچەکانیتری جیهاندا رەش بینبن ئەگەر زەمینە کولتووری، ئابووری و سیاسییەکان فەراهەم بن، ئەم جۆرە سیستەمە دەکرێ دابمەزرێت.

خەڵك سالاری تەنیا زەین و ئارەزوو بنیات نانرێت، بەڵکو بەکارهێنانی گشت پێداویستییەکان و بەهێزکردنی دامەزراوەگەلی تایبەت دەکرێ موژدەی دامەزراندنی ئەم سیستەمە لە گشت جیهاندا، بدرێت.



# بەشی چوارەم

# تەحەدی پلۆرالیزم و دیموکراسی

پۆلۆرالیزمی سیاسی یەکێك لەو چەمکانەیە کە هەندێ لە زانایانی زانستە رامیارییەکانی بە خۆوە سەرقاڵ کردووە و توێژیتەوەکانی تایبەت بەم چەمکە بە چەند دەیەی رابردوو بە تایبەتیش لە دەیەی ١٩٩٠ گۆڕانی زۆری بەسەرداهاتووە. خەسڵەتەکانی پۆلۆرالیزم بریتین لە: زۆربەیی و جۆراوجۆری ئەکتەرەکان، رکابەرێتی گرووپی، بەشداریی بەرفەراوانی سیاسی، جۆراوجۆری سەرچاوەکانی دەسەڵات، سووڕانی نوخبەکان (واتە دەست بوونی دەسەڵات) بە پێی شیکردنەوە سەرەکییەکانی پۆلۆرالیزم، ئەگەری تاقمی دەسەڵاتدار لە دەوڵەتی پۆلۆرالیزمدا رێکخستنی پەیوەندی نێوان گرووپ و تاکەکان بە مەبەستی هێنانەدی دادپەروەری و دامەزراندنی دیسپلین و ئازادییە.

بوونی فرەستراکتۆریی و سەربەخۆیی سیستەمە لاوەکییەکان لە سەربەخۆیی لە کارکردندا دەتوانێت زەمینە بۆ پۆلۆرالیزم فەراهەم بکات. ئەم بارودۆخەش دەبێتە هۆی کراوەیی سیستەم و بەرزبوونەوەوی ئاڵ و گۆری نێوان سیستەمی سیاسی و ژینگە، کە هەلومەرجی بۆ گەشەسەندنی سیاسی فەراهەم دەکات.

لەم بەشەدا هەوڵدەدەین لە چوارچێوەی توێژینەوەکانی ئەزموونی و بە روانگەیەکی پاسۆلۆژییانە، سەرەڕای شیکردنەوەی پرۆسەی گۆڕینی داواکارییەکان بە سیاسەت لە شێوازە جۆراوجۆرەکانی رۆژئاوادا،بە تایبەتیش دوای هەرەس هێنانی بلۆکی رۆژهەڵات خوێندنەوەی بۆ بکرێت.

پۆلۆرالیزم وەك رێبازێك لە زانستە سیاسییەکاندا جەخت لەسەر دامەزراوەگەرایی رەفتارگەرایی و پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا و حکوومەت دەکات، لە پرۆسەی خوێندنەوەی ئەم بابەتە، رەهەندی چالاکی سیاسەت لە چوارچێوەی فاکتەری وەك بەشداریی گشتی لە چەندین ئاستی سیاسەتدا و لە دامەزراوە جۆراوجۆرەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا رەچاو دەکرێت، زۆرجار، ئەم پرۆسەیە ئێمە رووبەڕووی دوو پرسی دژ بەیەکتر دەکاتەوە، پێویستە لە حالەتی گوێ نەدانی تاکەکانی کۆمەڵگا و دەست نەگەیشتنیان بە پانتای سیاسەت دارشتن و بە پێچەوانەشەوە ئاستی بەرزی بەشداریی

گرووپە جۆراوجۆرەکان و دواجار ناتوانایی بڕیاردەران لە دابینکردنی داواکارییەکانی هاووڵاتیان، بە دوای رەگی ناکۆکییەکان لە کۆمەڵگادا بگەڕێین.

لە بارودۆخی بەرز بوونەوەی ئاستی رکابەرێتی گرووپی و هەوڵدانی سیستەمی سیاسی بۆ گۆڕینی داواکارییەکان بەسیاسەت، پرسی هەماهەنگی و کونترۆل، رەهەندی نۆیتر وەردەگرێت و خودی ئەمەش مومکینە هەل بۆ دەست گەیشتنی بە دەسەلات، بەبیانووی دامەزراندنی دیسپلین و کۆنترولکردنی کاروبارەکان، فەراهەم بکات، ئەم چەشنە بارودۆخە، بەشداریی سیاسی بێ ئامانج دەکات و سیاسەت، پەیوەندی نێوان بەهاکان و دەسەلات کە گەرتنی مەشروعییەتی سیستەمی سیاسی دەکات، لاواز بکات.

لە چوارچێوەی پۆلۆرالیزمدا سیاسەت بە "گەمە" هەژمار دەکرێت کەتیایدا گرووپە رکابەرەکان بۆ سەرکەوتن، رکابەرێتی یەکتر دەکەن. بەم جۆرەش هێنانەدی دیسپلین لە کۆمەڵگادا پێویستی بە رێککەوتن لەسەر" رێساکانی گەمە"ی هەیە. هەر تاقمێك لە رکابەرە سیاسییەکان ستراتیژییەك هەڵدەبژێرن کە ئەوپەری سوودمەندی هەبێت.

کاتێك کە سەرکەوتنی لایەنێك بە شکستی لایەنێکیتر بێت، گەمە بە کۆی گشتی سفر ئەنجامدەدرێت، کە خەسڵەتەکانی بریتین لە بەرز بوونەوەی ململانێیەکان و پێکدادان. هاوکاری نێوان ئەکتەرەکان، دەبێتە هۆی گەمە بە کۆی گشتی پۆزەتیڤ، بەلام سەرنەکەوتنی لایەنەکان، دەبێتە هۆی گەمە بە کۆی گشتی نگەتیڤ.

پۆلۆرالیزمی سیاسی لە شیکردنەوەکانیدا سوود لە دوو پرەنسیپی سەرەکی هزرکردنەوەی سیاسی وەردەگرێت: یەکەم: هەژمار کردنی خەڵك وەك هاووڵاتی، دووەم: چونێتی چاودێری کردنیان بەسەر دەسەڵاتی حکوومەتەوە. لێکدانەوەی سیاسەتی پۆلۆرالیزمی لە چوارچێوەی گەمەدا سێ پرسیاری سەرەکی گەڵاڵە دەکات: چ کەسانێك فەرمانڕەوایی دەکەن؟ بنەماکانی سیستەمی سیاسی چین؟ چۆن پرۆسەی سیاسەتی گشتی دەبێتە هۆی گۆرانکاری کۆمەڵایەتی؟



بە سوود وەرگرتن لەم پرسیارانە دەتوانین شێوازەکانی پۆلۆرالیزم لێك جیابکەینەوە. هەڵبەت بۆ ئەم کارەش پێویستە فاکتەرە سەرەکییەکانی پۆلۆرالیزمی سیاسی رەچاوبکەین کە بریتین لە: سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی دەسەلات، فرەیی و جۆراوجۆری ئەکتەرەکان، بوونی بەرژەوەندی جۆراوجۆر و هەندێ جار دژ بەیەك، مشتومڕ. ئاڵ و گۆڕی رکابەرێتی گرووپی، دەست بە دەست بوونی دەسەلات و بەشداریی ئاشتیخوازانە.

### ١-پۆلۆرالیزمی کۆمەڵی:

بە بۆچوونی زۆرێك لە پۆلۆرالیزمەکان، وابەستەیی نەتەوەیی، عەشیرەیی، خوێنی و نەژادی کە لە هەندێ کۆمەڵگای هاوچەرخیشدا دەبینرێ، لە تایبەتمەندییەکانی جیهانی سێیەم هەژمار دەکرێن. نموونەی ئەم دۆخە ئەم ناکۆکییە نەتەوەیی و نەژادییانە لە ئەفریقیای باشوور، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، نیجریا و لە زۆرێك لەو ولاتانە بە نەتەوەگەلی جۆراوجۆر و جیاواز دەبینین. لەم جۆرە پۆلۆرالیزمەدا، گرووپی جۆراوجۆر لە نێوان تاك و دەوڵەتدا هەن و بەم جۆرەش فرەیی دەسەلات لە خەسڵەتەکانی ژیانی کۆمەلایەتی هەژمار دەکرێن، پەرەسەندنی ئەم دۆخە ناکۆکیزایە، لێکترازانی یەکبوونی نەتەوەیی لێدەکەوێتەوە کە تیایدا زۆرلێکردن جێگەی سازش و رێککەوتن دەگرێتەوە. زۆرجار ناکۆکییەکان لەسەر بەرژەوەندییە مادییەکان ئاراستەی ناکۆکی قوولی لەسەر بەهاکان دەگۆڕدرێت و بە زیاد بوونی نارەزاییەکان، نوخبە سیاسییەکان بۆ پاراستنی دەسەلات، پشت بە سەرکوتکردن و هەندێ جاریش کودەتا دەبەستن.

لە هەلومەرجێکدا کە گرووپێکی کولتووری کونترۆلی حکوومەت بگرێتە دەست، دەسەلاتە سیاسییەکەی بۆ گوشار خستنەسەر گشت بەشەکانیتری کولتووری بەکاردێنێت. لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا هەر کە فاکتەرە سەرەکییەکانی دروستکردنی یەکپارچەیی، بۆ نموونە ئایدیۆلۆژیای گشتگیر و توانا سیمبولییەکان لاواز بن سیستەم





ڕووبەڕووی قەیرانی یەکپارچەیی دەبێتەوە و مومکینە بزاڤی خۆ دوورخستنەوە لە ناوەند و جیاخوازی سەر هەڵبدەن لەم هەلومەرجەدا بۆ دەرباز بوون لە قەیرانی شوناس دژبەیەکی نێوان میکرۆناسیۆنالیزمەکان و مایکرۆ ناسیۆنالیزمەکان ڕەهەندگەلی نوێ بە ناکۆکییەکان دەبەخشێت و بەرە بەرە وابەستەیی خۆجێیی جێی وەفاداری نیشتیمانی دەگرێتەوە.

پرسی سەرەکی کە لەم قۆناغەدا گرنگی تایبەتی هەیە ئەوەیە کە هەر کولتوورێك چ ڕادەیەك لە دەسەڵاتی پێویستە؟ تا چ ڕادەیەك پێویستە ئەم گرووپانە لە دەسەڵات سوودمەندبن؟ ئایا هەر گرووپێك بەستراو بە نوێنەرایەتیکردن بۆ دانوساندن لەگەڵ گرووپەکانیتری هەیە؟

لە سەرەتای ساڵانی١٩٩٠ پۆلۆرالیزمی کۆمەڵی لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان تەنانەت لە ئەورووپای ڕۆژئاواش لە ڕەهەندی جۆراوجۆردا بەرچاو دەکەوێت. بە چەشنێك کە لەم ئاراستەیەدا گرووپە نەژادییەکانی باڵا دەست، لێبوردەیی کەمتریان لە هەمبەر کۆچەرەوە ئەفریقییەکان، ئاسیایی و ئەورووپای ڕۆژهەڵات (یوگسلاڤیا، ڕومانیا، بولگاریا هەبووەوە، پۆلیس دەسەڵاتی جێبەجێکردنی زۆرتری بۆ بەرەنگار بوونەوەی بیانییەکان (بە تایبەت نائەورووپییەکان) هەبووە. بەلانیکەمەوە لە بەخشینی پەنابەرێتی سیاسی بۆ ئەم کەسانە گرفتی دروستدەکرد.

لە زۆرێك لە ناوچەکان ئەورووپای ڕۆژهەڵات، ئەفریقیا، ئاسیای باشوور، کارایب و باسفیکی باشوور، پۆلۆرالیزمی کۆمەڵی یارمەتیدەری پێکهێنانی پرۆسەگەلی سیاسی نوێ بووە. هەروەك ئاماژە پێکرا کاتێك کە پۆلۆرالیزمە لیبرالەکان سەیری سیاسەت وەك گەمەیەك بە کۆی گشتی پۆزەتیڤ دەکرد، خوازیاری هەل ڕەخساندن بۆ گشت گرووپەکان بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسی بوون، پۆلۆرالیزمە کۆمەڵییەکان سەیری بڕیارەکانی حکوومەت وەك گەمەیەك بە کۆی گشتی سفر دەکرد، لەم ڕێڕەوەدا ئامانجی سەرەکی سیاسی کونترۆڵی حکوومەتی ناوەندە. ئەویش تا ئەوڕادەیەی کە گرووپە ئایینی و نەژادییەکانی و سیاسی بن. زۆرجار گرووپ دەسەڵاتداری ئایینی یا



خود نەژادی بە بەکارهێنانی دەسەڵاتی حکوومەتییەکەیان گرووپەکانیتر سەرکوت دەکەن، ئەم گرووپانە مافێکی سنووردا ریان لە بەشداریکردنی سیاسیدا هەیە. بەم جۆرەش بەرژەوەندی کەمیان بەدەستدەکەوێت.

پێویستە ئاماژە بدرێت کە سیستەمی سیاسی لە ژێر کۆنترۆڵی پۆلۆرالیزمی کۆمەڵی زۆر لەرزۆکە، بە چەشنێك کە سەرکردە سیاسییەکان بە ئاسایی ناتوانن ناکۆکییەکان بە شێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکەن. هەروەها لەم جۆرە پۆلۆرالیزمەدا، گرووپە زاڵە سیاسییەکان پەیوەندی کەمیان لەگەڵ گرووپەکانیتردا هەیە.

بە زیادبوونی چەندایەتی گرووپە کۆمەڵی و نەژادییەکان، بۆچوونگەلی جۆراوجۆر لە لایەن هەریەك لەمانەوە گەڵاڵە کراوە، مومکینە ڕێکەنەکەوتن و سازش، پشێوی سیاسی و لێکترازانی کۆمەڵایەتی بەدواوە بێت ئەمڕۆکە نموونەی بەرجەستەی پۆلۆرالیزمی کۆمەڵی لە ئەفغانستاندا دەبینریت، لەم چەشنە بارودۆخەدا ئەگەر لەم وڵاتەدا هاوپەیمانییەك لە گرووپە جۆراوجۆرەکانیش دابمەزرێت، ناکۆکی قوولی بۆچوونەکان، حکوومەتە هاوپەیمانەکان زۆر لەرزۆك دەکات و پاش ماوەیەکی کورت دووبارە ململانێ دەستپێدەکاتەوە.

## ٢- پۆلۆرالیزمی لیبرال:

لەم جۆرە پۆلۆرالیزمەدا دەوڵەت وەك فاکتەری بەرقەرارکردنی هاوسەنگی و ناوبژیوانی لە نێوان گرووپە جۆراوجۆرەکاندا، کار دەکات. لەم ڕەوتەدا کاربەدەستە حکوومییەکان هەوڵی لێك نزیك کردنی ئەو جۆراوجۆری سیاسی دەدن کە لەلایەن گرووپەکانەوە گەڵاڵە کراوە. لەم بارودۆخەدا ئەگەر بەرهەڵستکاران بەدەست بهێننەوە، لەو کاتەوە لە ڕێگەی دادگا و بەپێی دەستوور ئەم ئەنجامدەدەن، کاتێك کە گرووپی نارازی بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان خاوەن پشتگیری بەهێز بن، دەتوانن لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی حیزب و سەندیکاکان پەیگیری مافەکانیان بن لەم





قۆناغەدایە کە دوای دانوساندن، دیالۆگ، قەناعەت پێکردن و سازش، هەندێ لە داواکارییەکان دەبن بە سیاسەت.

بەم جۆرەش پۆلۆرالیزم هەل بۆ خەڵکانێك دەرەخسێنیت کە سەرچاوەگەلی سیاسی بە ئاراستەی دابینکردنی بەرژەوەندی و بەها گەلی تایبەت مۆبیلیزە بکەن، کە ئەم کارەش بە تێپەر بوونی کات دەسەڵاتی ئۆرگانەکانی حکومەتکەر سنووردار دەکات. لەم بارودۆخەدا کاتێك کە ناوەندێکی دەسەڵات لە هەمبەر ناوەندەکانیتردا بوەستێتەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەسەڵاتی حکوومەت سنووردار و کۆنترۆڵ بکرێت.

بە پێی تیۆری پۆلۆرالیزمی لیبرال، پرۆسەی سیاسی وەك بازاڕێکی ئابووری کار دەکات، چونکە لە پانتایی ئابووریدا، کڕیاران بۆ بەدەستهێنانی خزمەتگوزاری و کاڵاکان پارە دەدەن، ئەم کارەش لە ڕێگەی ڕێساکانی بازاڕەوە، کرێکار بە فرۆشیار گرێدەدات. لە بازاڕی ئازاددا جۆرە هاوسەنگییەك لە نێوان داواکردن و خستنە ڕوودا دێتە کایەوە، کە بەرزبوونەوەی داواکاری یا خود کەم بوونەوەی بەرهەمهێنان هاوسەنگی بازاڕ تێکدەدات بە بەراورد لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا، لە پانتای سیاسیش خەڵك (کڕیاران) لە ڕێگەی دەنگەکانیانەوە (پارە) سیاسەتە گشتییەکانەوە (کاڵا و خزمەتگوزارییەکان) کە لەلایەن کاربەدەستە سیاسییەکانەوە (خستنە ڕووکاران) پێشکەش دەکرێن، لە میانەی دامەزراوە یاساییەکانەوە (ڕێساکانی بازاڕ) داوا دەکەن لەم ڕەوتەدا ستراکتۆرەکانی نوێنەرایەتیکردن بە تایبەتیش ئەنجوومەنەکانی یاسادانان و پارتەسیاسییە هاوپەیمانەکان کە هەموو جۆرە ڕێکخراوە دەسترۆییەکان لە خۆ دەگرن. خەڵك بە سەرکردنیان گرێدەدەن. لەم بارودۆخەدا، دەزگای حکوومەت، پارتە هاوپەیمانەکان و ئەنجوومەنە خۆبەخشەکان هەوڵ بۆ هێنانەدی هاوسەنگی لە نێوان داواکارییە گشتییەکان و سیاسەتی گشتی دەدەنە چوارچێوەی پۆلۆرالیزمی لیبرال، پێشوی سیاسی کاتێك ڕوو دەدات کە ڕێژەی داواکارییەکانی خەڵك لە حکوومەت، زۆرتر لە تواناییەکانی حکوومەت بۆ وەڵامدانەوەی خەڵك بێت ئەگەر هەوڵبدەین ئەم بابەتە لە چوارچێوەی شیکردنەوەی سیستەمی بخەینەڕوو، پێویستە ئاماژە بدەین کە لە پراکتیکدا موخریجاتی (OUT PUT) سیستەمی کەمتر لەو مودخیلاتانەن ( IN



PUT) کە بۆی بەرز دەکرێتەوە، ئەمەش بەرە بەرە دووبارە گەڕانەوەکان ( FECD BACK) نگەتیڤ زیاد دەکات، لە ئەنجامدا سیستەم لە دۆخی هاوسەنگی دوور دەبێتەوە. لە پۆلۆرالیزمی لیبرالدا. کاتێك گرووپەکان دەتوانن داواکارییەکانیان بکەن بە سیاسەتی گشتی، کە خاوەن سەرچاوەی پێویست و یەکگرتوویی ڕێکخراوەیی بۆ کاریگەر بوون لە سەر پرۆسەی سیاسیدا بن، سەرەڕای پەیوەندیکردن لەگەڵ گرووپەکانیتر دەستیان بەکاربەدەستە حکوومییەکان بگات. بە هۆی دابەشکردنی دەسەڵات لە سیستەمی پۆلۆرالیزمدا، وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرخۆ و لە ڕادەبەدەرە و سیاسەتمەداران لە بەری گۆڕانکاری گشتگیری کۆمەڵایەتی، زنجیرە چاکسازییەك لە هەندێ کەرتی تایبەتی کۆمەڵگا دەدەن.

سەرەڕای جەختکردنە سەر ڕێککەوتن لە نێوان گرووپە جۆراوجۆرەکاندا، چونکە زۆربەی ئەنجوومەنە خۆبەخشەکان خاوەن ستراکتۆری ناناوەندگەرا و ناهەماهەنگن بۆیە بە ئاسانی لە نێوان ئەنداماکانیاندا سازش و ڕێککەوتنی سیاسی دروستنابێت. چونکە زۆرێك لە پۆلۆرالیزمە لیبرالەکان لەو بڕوایەدان کە، گۆڕان و وەرچەخانە کۆمەڵایەتییەکان پێویستە لە سەرەخۆ و بە بەرفراوانی ئەنجامبدرێن، بۆیە ئەم بۆچوونە زۆرێك لە سیستەمە ئەمریکای باکوورو ئەورووپای ڕۆژئاوای ڕووبەڕووی بن بەستی حکوومەتی، بێ جوولەیی کردووە پەیڕەوی کردنی ستراتیژی بە بەرفراوانی (واتە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بەرفەراوان) چونکە بۆ بەرەنگار بوونەوەی تەحەددییە هەنۆکەیی و داهاتووەکان، پشت بە رابردوو دەبەستێت، بۆیە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکارییە گشتییەکان زۆر بە وریاییەوە کار دەکات.

پۆلۆرالیزمە لیبرالەکان گرووپە جۆراوجۆرەکان وەها وێنادەکەن کە هەریەك بۆ بەدەستهێنانی سەرچاوە نایابەکان رکابەرێتی یەکتر دەکەن سەرەڕای ئەوەی کە هیچ یەك لەم گرووپانە لە پرۆسەی رکابەرێتیدا گشت داواکارییەکانیان دەستەبەر ناکەن، بەڵام ڕەزامەندییەکی ڕێژەیی بە دەستدێنن، بەڵام لە ڕاستیدا هەندێ گرووپ هیچ کاتێك دەرفەت بۆیان نارەخسێت کە پێداویستییەکانیان دابینبکەن.





ڕەخنەگرانی پۆلۆرالیزمی لیبرال بە هۆی مەیلدار بوونی ئەم ڕەوتە بە جۆرە نوخبەگەراییەك، ڕەخنە ئاراستەی دەکەن. بە بڕوای ئەوان ئەگەر ڕکابەرێتییەکیش بوونی هەبێت، ئەم ڕکابەرێتی نێوان نوخبەکان و کۆمەڵی خەڵك لێی بێ بەشن، بەم جۆرەش بوونی نوخبەیەکی بەهێز هەل و مەرجێك دێنێتە کایەوە کە لە میانەیدا هەندێ کەس لە کاروباری هەڵبژاردنەکاندا دوور دەخرێنەوە. ئەنجامەکانی ئەم بارودۆخە دەکرێ لە گوێ نەدانی بەرفراوان، بەشداریی نەکردن لە هەڵبژاردندا و بەرهەڵستکاری توندوتیژاویی ببینرێت.

پۆلۆرالیزمی لیبرال و شێوازە بەکارهێنەرەکانی، زۆرجار بنەماگەلێك لەلایەن خەڵکەوە دروستدەکات و پەرە بەم گومانە دەدات کە خەڵك بڕیاردەری سەربەخۆن و دەتوانن کاریگەری لەسەر نوخبە دەسەڵاتدارەکان بنوێنن. هێرشی سەرەکی بۆ سەر لیبرالەکان کاتێك دەستپێدەکات کە گرووپە کەم داهات، لاواز و ڕێك نەخراوەکان لە لایەن ئەم ڕەوتەوە پشتگێری دەکرێن.

### ٣- پۆلۆرالیزمی توندڕەو:

لە ڕوانگەی پۆلۆرالیزمەکانی تەندڕەوەوە، پارتە سیاسییەکان. ڕێکخراوە خۆبەخشەکان و دامەزراوە حکوومەتییەکان ڕەنگدەرەوەی بەرژەوەندی چینە دەوڵەمەندەکانی کۆمەڵگان کە زۆرترین و چالاکترین ڕۆڵیان لە ژیانی سیاسیدا هەیە. لەم چەشنە بارودۆخەدا لە ڕووی سیاسییەوە نوخبە دەسەڵاتدارەکان، لە هەمبەر سیاسەتگەلێك کە بارودۆخی بەرقەرار تێکدەدات، مافی ڤیتو بەکار دێنن هاوکات زۆربەی تاکە بێ دەسەڵاتەکانی کۆمەڵگا کە دیسپلینی ئەوتۆ و سەرچاوەگەلی پێویستیان بۆ دارشتنی سیاسەتی گشتییان نییە، کەمترین ڕۆڵیان لە بەڕێوەبردنی حکوومەتەدا هەیە.

لە ڕوانگەی بێ دەسەڵاتەکان و لایەنگرە ڕادیکالییەکانیانەوە، ڕێساکانی کەمەی پۆلۆرالیزمی لیبرال بە چەشنێکە کە سیستەمی سیاسی، گشت تەنیا بۆ گرووپی



کەمینە دەزانێت. واتە گرووپێك کە پرۆسەی سیاسی لە ڕێگەی سامان، زانیاریی و شارەزایی لە پەیوەند پێکردندا لە دەست دەکرێت. بەم پێیەش تەنانەت لە هەلومەرجێکدا کە گشت خەڵك لە بەرامبەر یاسادا یەکسانن، بەڵام لە ڕووی تیۆرییەوە، پۆلۆرالیزمەکان جەخت لە سەر سیستەمی سیاسی پشت بەستراو بە یەکسانی، چەق نەگرتن (لامرکزیە) و بەشداریی بەرفراوان دەکەنەوە لە پێناو ڕێکخستنەوەی گرووپە پەرت و بڵاوەکان، بەهێز کردنی لاواز و هەژارەکان هەوڵدەدەن، ئەوان دامەزراندن و بەهێز کردنی کەناڵەکان بۆ خستنەڕووی داواکارییەکان لە پێداویستییەکانی بەشداریکردن و دەست گەیشتنی خەڵك بە حکوومەت و بەشداریکردنیان لە پرۆسەی داڕشتنی سیاسەتی گشتی بە پێویست دەزانن بە پێی تیۆری پۆلۆرالیزمی توندڕەوەوە وەها وێنا دەکرێت کە ڕێگەی بەشداریی بەرفراوانی خەڵك لە ڕێکخراوەکاندا، ئەوان لەگەڵ نۆرمگەی دانوساندن، گفتوگۆ، قەناعەت کردن، هاوکاریی، بەرپرسیارێتی مەدەنی کە بۆ هێنانەدی دیسپلینی سیاسی و وەرچەخانی کۆمەڵایەتی پێویستن، ئاشنا دەکات.

پۆلۆرالیزمە توندڕەوەکان، حەز لە بەشداری ڕاستەوخۆی هاووڵاتیان لە بڕیارگەلێکدا دەکەن، کە کاریگەری دەخاتە سەر ژیانیانەوە، بە پێچەوانەی پۆلۆرالیزمە سونەتییەکان کە حەز لەبنکەکانی ڕکابەرێتی دەسەڵات و پەیوەندی گرووپی دەکەن، پۆلۆرالیزم توندڕەوەکان جەخت لەسەر تاك دەکەنەوە و هەوڵ بۆ ناساندنی ڕێکخراوەکانی بەشداری سیاسی دەدەن، ئەوان هەوڵ بۆ گەیشتن بە جۆرە کۆدەنگی و سازش دەدەن، بەڵام حەز لە چارەسەرکردنی کێشەکان لە لایەن سەرەوە (دەسەڵات) ناکەن.

### شیکردنەوەی سیستەمیانەی پرۆسەی پۆلۆرالیزم:

بە گشتی پۆلۆرالیزمی سیاسی سەرەڕای ڕەچاوکردنی ئەولەوییەتی تاك و گرووپەکان، چۆنێتی گۆڕینی داواکارییەکان بە موخرەجاتەکان (OUT PUT) یا





خود ئەنجامە سیاسییەکانیش ڕەچاو دەکات، خوێندنەوەی پۆلۆرالیزم لە چوارچێوەی دامەزراوەگەرایی و ڕەفتارگەریدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئێمە بە پرەنسیپە سیاسییەکانی قوتابخانەی سوودگەرایی نزیك ببینەوە. تیۆری ڕەفتاری سوود، بە چۆنێتی پێکهاتنی ڕەفتاری دەنگدەران و دەست نیشانکردنی ئەولەوییەتەکان لە ڕێگەی هاوپەیمانی گرێدانەوە گرنگی دەدات. لە پراکتێکدا دەبینین کە لە زۆر ڕەهەندە ئەم مودیلە وەك مودیلی ئابووری کلاسیك بەرەو چەندایەتی کردن مەیلدارە پاڵنەری بە بەرزترین ئاست گەیاندن سوود دەتوانێت لە ڕێگەی هێماگەلی وەك ڕێژەی هەڵبەز و دابەزینی ڕەفتاری دەنگدانی تاکەکان و ڕادەی پشتگیری کردنی حیزب هەلبسەنگێندرێت. هەر بۆیە زۆرجار پۆلۆرالیزمەکان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان سوود لە نموونە سیاسییەکانی دەروونناسەکی وەردەگرن، تا بەم جۆرە ستراتیژییەکانی سیاسەت دارِشتنی حکوومەت لە ڕێگەی دووبارە گەڕانەوە (FEED BACK) هەڵبسەنگێنن. بەپێی ئەم مودیلە، پالنەرە گرووپی و ڕکابەرێتییەکان دەبنە هۆی دامەزراندنی دامەزراوەگەلی جۆراوجۆر، تالەم ڕێگەیەوە ئەوپەری ڕەزامەندی ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتیان دەستەبەر بکرێت.

هەروەك پێشتر باسکرا لە تیۆری ئابووریدا، ڕێساکانی بازار بە چەشنێکن کە دەتوانن بەرژەوەندییەکان بەپێی ئەولەوییەتەکانی بەکاربەر ڕێکبخەن. ئەم ئەولەوییەتە بە پێی نرخ و چونێتی خستنەڕوو و داواکردن دیار دەکرێت. لە تیۆری پۆلۆرالیزمدا، بازاڕی سیاسی (شۆینی دەنگدان) هەمان ئەمانجەکان وەکو ئابووری پەیگیری دەکات.

مودیلی سیبرنتیکی بەشداری سیاسی، هۆ و ئەنجامی دووبارە گەڕانەوە ( FEED BACK) بەپێی دەست گەیشتنی ئازادانەی تاك و گرووپەکان بە سندووقەکانی دەنگدانە. بەپێی گەمەی دەنگدان، پالێوراوە ڕکابەرەکان بۆ کێشەکان دەخەنەڕوو. دەنگی خەڵك بەواتای ڕێژەی گونجاویی پلانی پالێوراوەکان لەگەڵ پێداویستییەکانی خەڵك دێت. بەم جۆرەش سەرکەوتنی پالێوراوێك لە هەڵبژاردنەکاندا، پێویستی بە هەبوونی زانیاری ورد لەسەر خواست و ئەولەوییەتەکانی دەنگدەرانە. هەروەها



پێویستە دەنگدەرانیش توانایی و ڕامانی پێویستیان بۆ هەڵسەنگاندنی پلانی پالێوراوەکان هەبێت، لەم چەشنە بارودۆخەدا بەرپرسیارێتی حکوومەت لە هەمبەر گشت خەڵکدا پێویستی بە ئاڵوگۆڕکردنی بەردەوامی زانیارییەکان و گونجان لەگەڵ پێوەرەکانی تایبەت بە تێچوون و سوود، هەیە.

لێرەدا ڕەگەزی سەرەکی دووبارە گەڕانەوەیە (FEEDBACK) کە لە کاریگەری موخریجات (OUT PUT) بەسەر مودخیلاتدا (IN PUT) بەدەستدێت. بێگومان هەر جۆرە وێنا کردنێك بۆ دابینکردنی داواکاری و بەرژەوەندییە گشتییەکانی خەڵك، هەندێ نارەزایی دەربڕین و قەیرانگەلی بەدواوە دێت چونکە لەم ڕەوتەدا تەنیا پەیوەندی چەندایەتی لە نێوان مودخیلات و موخریجاتدا کارامەیی ڕاستەقینەی سیستەمی سیاسی نیشاننادات. بوومانابە، کە بۆ نموونە لە بەشی مودخیلاتی سیستەمدا ٤٠ یەکەی داواکاری و لە بەشی موخریجاتدا ٣٥ یەکەی وڵامدانەوە بوونی هەبێت بەڵام مومکینە لە پراکتیکدا ٣٥ یەکەی موخریجات وەڵامدەرەوەی ٥٪ پێداویستییەکانی کۆمەڵگا بێت و ئەم ٥٪ەش دابینکەری داواکارییەکانی گرووپە بەهێز و دەستڕۆکانی کۆمەڵگابێت. بەڵگە نەویستە لەم چەشنە بارودۆخەدا سیستەمی سیاسی ڕووبەڕووی دووبارە گەڕانەوەی نگەتیف دەبێتەوە لەوانەیە بەردەوام بوونی ئەم بارودۆخە دەوڵەت ڕووبەرووی قەیرانگەلی نوێ بکاتەوە بە پوختی دەکرێ بەپێی تیۆری پۆلۆرالیزم، کارکردی سیستەم. لە چوارچێوەی شیکردنەوەی سیستەمانە بە شێوەی خوارەوە ڕوون بکەنەوە.





**خوێندنەوەی پۆلۆرالیزمی سیاسی:**

دوای رووخانی یەکیتی سوڤیەت، هەندێ لە تیۆردارانی رۆژئاوا لەوبڕوایەدا بوون کە دیموکراسی لیبرال سەرکەوتووە و مێژوو بە کۆتاهاتووە تەقینەوەی ناکۆکییە فرەلایەنەکانی نەژادی، ئایینی و نەتەوەگەرایی لە هەلومەرجێکرا روودەدەن کە هەندێ لە دیموکراتەکانی رۆژئاوا ئەم رووداوانە تایبەت بە سەردەمی کۆن دەزانن لە هەمبەر پرۆژەی" سیستەمی نوێی جیهانی" ئیمە وەرچەرخانگەلی بنەرەتی لە ئاستی نزمدا (میکرۆ وەرچەرخان) رووبەڕووی بێرەنگ بوونی شوناسەکان و سەرهەڵدانی لێکترازان لە ئاستی نزمدا دەبینەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە هەندێ تیۆرداڕێژەرانی پولۆرالیزمی لاوازی بلۆکی سۆشیالیستییان بە سەرکەوتنی دیموکراسییەکانی رۆژئاوا هەژمار کردووە، بەڵام لەراستیدا ئەم سەرکەوتنە وێنەییە، زۆرتر پەیوەستە بە هەرەسهێنانی خودی دۆژمن (کۆمونیزم) تا بە سەرکەوتنی خودی دیموکراسی لیبرال. بە واتایەکیتر قەیرانی کۆمۆنیزم، دیموکراسییەکانی رۆژئاوای رووبەڕووی تەحەددییەکی نوێی کردووە و لاوازییە شاراوەکانی ئاشکرا کردووە.

لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان چوونەتە ناو پرۆسەی جیددییانەی سەرلە نوێ پێناسەکردنی شوناسەکانیان و سەرهەڵدانی سنووری سیاسی نوێیان تاقیکردووەتەوە. دەبێ ریشەی ئەم وەرچەرخانانە لە هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم و چەقی ململانێی نێوان دیموکراسی و تۆتالیتاریزمدا بدۆزینەوە کە دوای شەڕی دووەمی جیهانی بوو بە هۆی سنووردارێشتنی سیاسی و ئایدیۆلۆژیکی، شایانی ئاماژە پێدانە کە بەشێکی زۆری دوژمن (کۆمۆنیزم) بووە هەنۆکە کە دوژمن لە گۆڕەپاندا نەماوە، خودی چەمکی دیموکراسی لیبرال بە هۆی پۆلۆرالیزمی سیاسییەوە، چوارچێوەیەکی تەم و مژاویی لە خۆ گرتووە، تاڕادەیەك کە هەندێ لە تیۆر داڕێژەران هەوڵی خستنەڕووی پێناسەیەکی نوێی بۆ دەدەن و سنووری نوێ



دادەڕێژن. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە هەلوێستی راست و چەپی میانڕەو لەگەڵ ئەم وەرچەرخانە، زۆر توندتر لە راستی توندڕەو بووە، چونکە راستی توندڕەو هەر لە ئێستاوە دوژمنی خۆی دۆزیوەتەوە. لە راستیدا، لە ناوخۆدا بە دوای دوژمن دەکەوێت تا لە دەرەوە واتە لە نێوان کۆچبەر تا شوناسی کولتووری "راستەقینە" هەژمار دەکرێت. پەرەسەندنی راستی توندڕەو دەربڕی قەیرانی قووتی سیاسییە کە لە میانەیدا دیموکراسی لیبرال لە خەسڵەتە بەرجەستە و جیاکەرەوە سوننەتییەکانی دووردەخاتەوە بەرەو دووبارە داڕشتنی سنوورە نوێیەکانی سیاسی دۆست و دوژمن ئاراستە دەکات.

بەم جۆرە بەپێی بابەتەکانی کە پێشتر ئاماژە پێکران، وەها دەردەکەوێت کە ئەم بەڵگانە زۆر راست نەبێت کە وەها وێنا بکەن نەمانی کۆمۆنیزم بە واتایی سەقامگیر بوونی خەڵك سالاری پۆلۆرالیزم دێت. هەروەها ناتوانین نەمانی دوژمنی کۆن بەواتای پێشکەوتن و سەرکەوتنی گەورەی دیموکراسی لیبرال هەژمار بکرێت.

ئەگەر بێتو لە چوارچێوەی دیموکراسی لیبرال نەتوانن جیهانی بێ دوژمن وێنا بکەن، کەواتە چۆن موومکینە بڕوامان بە بەردەوامی ژیانی سیستەمی دیموکراتیکی پۆلۆرالیزمان هەبێت! زیاد لەمەش سیستەمێك کە بە پێی بنەماڵێك جیاکردنەوەی دۆست و دۆژمن دامەزرابێت، بەپێی پرەنسیپەکان نابێت لە چوارچێوەی پۆلۆرالیزمی سیاسیدا ئامرازی لە ناوبردنی دوژمن بێت. بەڵکو بە پێچەوانەوە پێویستە بە لێبوردەییەوە سەیر بکرێت، مەوجودییەتی بە مەشروع بزانێت و مافی دوژمن بۆ بەرگری کردن لە بڕوا و روانگەکانی بپارێزێت.

یەکێك لە ئاسەوارەکانی پڕ رەنگ بوونی سنوورە سیاسییەکانی نێوان چەپ و راست، گرفتگەلێکن کە بۆ شوناسە سیاسییە لێك جیاوازەکان سەری هەڵداوە کە ئەم بارودۆخەش سەرەڕای لاواز کردنی پۆلۆرالیزمی لیبرال، بووە بە هۆی گوێنەدانی سیاسی بە پارتەکان و نامەیلی لە بەشداریکردن لە پرۆسە سیاسییەکاندا. هەربۆیەش ئەمڕۆ کە پەرەسەندنی شێوازی جۆراوجۆری شوناسی دەستەجەمکی لە پال شوناسە





ئایینی، نەتەوەیی و نەژادین. لەم بوارەدا، ئەو شتەی کە ڕووبەڕووی پرسیار دەبێتەوە، سنوورەکانی نێوان" ئێمە" و "ئەوان"ە. کاتێك کە نەتەوەیەك ئەم پرەنسیپە پەسەند بکات کە هەر شوناسێك لۆژیکییە و مەرجی بەردەوام بوونی ژیانی شوناسەکان داننان بە جیاوازییەکانە، لێرەوە دەتوانین دەرگای گفتوگۆ لە نێوان شوناسە جۆراوجۆرەکان بکەینەوە. بۆ گەیشتن بەم ئەمانجە پێویستە لەسەر زمانی گفتوگۆ رێککەوتن ئەنجامبدرێت. هەڵبەت رێککەوتن لەسەر زاراوە و چەمکەکان بەس نییە، بەڵکو لە پلەی یەکەمدا پێویستە لەسەر شێوازی بەکار هێنانی زاراوەکان رێکبکەون. بە وتەی "ڤیتگن ئیشتاین" ئەگەر بڕیار بێت زمان وەك ئامرازی پەیوەندی کردن بە کار بێت، کەواتە پێویستە نەتەنیا لەسەر پێناسەکان بەڵکو لەسەر ناوبژیوانییەکانیش رێککەوتن بەدەستبێت. چونکە پۆلۆرالیزمی سیاسی لەسەر ئاڵوگۆڕی زانیارەکان جەخت دەکاتەوە، بەم جۆرەش هەر ئەندازە دووبارە گەڕانەوەکانی ( FEED BACK) زانیارییەکان زۆرتر پەسەند بکرێن، زەمینەی لەبارتر بۆ دابینکردنی داواکارییەکانی دەنگدەران فەراهەم دەبێت.

**بێ لایەنی دەوڵەت لە سیستەمی پۆلۆرالیزمدا:**

لە دەروونی پۆلۆرالیزمی لیبرالدا، ناکۆکییەك دەبینرێت، بەچەشنێك کە هەندێ جار لیبرالیزم رەتی دیموکراسی دەکاتەوە و هەندێ جاریش دیموکراسی، نکۆلی لە لیبرالیزم دەکات. بە گشتی پێویستە لە رێگەی سەرهەڵدانی قەیرانی پەرلەمانی لە دیموکراسییەکانی مودێرندا بە دوای ئەم بارودۆخە بکەوین. بەم پێیەش هەندێك لەو بڕوایەدان کە پەرلەمانتاریزم واتە بالادەستی دەسەڵاتی یاسادانان بەسەر دەسەڵاتی جێبەجێ کردندا بەجیهان بینی دیموکراسی پەیوەست نییە و پێویستە زۆرتر بە لیبرالیزم بلکێنرێت. لە چوارچێوەی پۆلۆرالیزمدا، دەولەتی پۆلۆرالیزم بریتییە لە دەوڵەتێك کە خاوەنی ئەوپەڕی فرەیی و جۆراوجۆری بێت، بەچەشنێك لە ئەرکی سەرەکی گرووپی دەسەڵاتدار، سەپاندنی دەسەڵاتی بێ سنوورنییە بەڵکو رێکخستنی



پەیوەندییەکانی نێوان تاك و گرووپەکانە تا دادپەروەری دیسپلێن و ئازادی دابین بکرێت، ئەم جۆرە دەوڵەتە لە رووی تیۆرییەوە وەك چاودێرێکی بێ لایەن شایەتی مشتومڕ، دیالۆگ، سازش و رێککەوتنی بەردەوامی نێوان گرووپەکانە. ئالۆزی کۆمەڵگا دیموکراتییەکان و سەرهەڵدانی پێشووی ئابووری، سیاسی و کۆمەلایەتی بووە هۆی ئەوەی کە دەوڵەت لە چاودێرێکی بێ لایەن دوور بکەوێتەوە و سەرەڕای فراوانکردنی پانتایی دەسەلات، لە زۆرێك لە کار و بارەکاندا کە لە مۆدیلی کلاسیکی لیبرالیزمدا رەتکرابووەوە، دەستێوەردان ئەنجامبدات. ئەم بارودۆخە لەگەڵ پرەنسییە سەرەتاییەکانی پۆلۆرالیزم کە تیایدا یاسا بە بڕیارەکانی فەرمانڕەوا هەژمار ناکرێن و بوونی دەسەڵاتی ناوەندی لە هەر دەوڵەتێکدا کە لە رووی ئەزموونییەوە نادروست دەزانێت، یەك ناگرێتەوە. بەم جۆرەش لە پرۆسەی وەرچەرخانی دیموکراسیدا، ئێمە شایەتی سەرهەڵدانی" دەوڵەتی گشت"ین کە بەدواهاتە کارکردییەکانی بۆ دامەزراوەکانی یاسادانان چاوەڕوان کراو نەبووە. ئەم دۆخەش لە ئیعتباری سیستەمی پەرلەمانی کەم دەکاتەوە، بە چەشنێك کە هەندێك بڕوایان بەو پرەنسیپانەی کە ئەم سیستەمە لەسەری دامەزراوە لە دەستیانداوە و ئەم کارەش بووەتە هۆی ئەوەی کە دیموکراسی پەرلەمانی خۆی لە بنیاتە زەینییەکان بێ بەش بکات. ئەم بارودۆخە نەتەنیا لە سەردەمی ئێستادا، بەڵکو لە دەیە سەرەتاییەکانی سەدەی بیستەمیش بوو بە هۆی ئەوەی کە هەندێ لە هزرڤانان وای بۆ بچن کە ئەگەر تەنانەت بلشڤیزم و فاشیزم سەرکوتیش کرابان، قەیرانی پەرلەمانتاریزمی رۆژئاوا هەر وەك خۆی دەماوە، هەندێ لەمەش زۆرتر رۆیشتوونە و لەو بڕوایەدا بوونە کە ئەم قەیرانە. تەنانەت پێش سەرهەڵدانی ئەم سیستەمانە بوونیان هەبووە و لە داهاتووشدا هەر بەردەوام دەبن.

پرسی بێلایەنی دەوڵەت پەیوەندی بە بوونی حکوومەتی سنووردار و لێك جیاکردنەوەی ژیانی تایبەت و گشتی لە چوارچێوەی پۆلۆرالیزمدا هەیە. هەندێ لە لیبرالەکان بە بڕوا هەبوون بە پۆلۆرالیزم کە لە میانەیدا دەستێوەرنەدانی دەوڵەت لە





ئازادانە هەڵبژاردنی تاکەکان بۆ ئامانجەکانیان بە پێویست دەزانن، لە پراکتیکدا نکۆڵییان لە دەوڵەت کردووە، چونکە. پۆلۆرالیزمەکان وەها شرۆڤەی ئازادی دەکەن کە پێش ئەوەی ئازادی لە ئەنجامەکانی سەقامگیری مافەکان بەپێی دەستوور بێت، لە ئەنجامی دابەش بوونی دەسەڵات بەسەر گرووپەکانداپە. بەپێی ئەم بەڵگاندنە پێویستە دەوڵەت بەردەوامی بە هەڵوێستی بێ لایەنەکەی بدات.

جەختکردنەوەی لەرادەبەدەری پۆلۆرالیزمەکان لەسەر بێلایەنی دەوڵەت بووە هۆی ئەوەی کە بە بۆچوونی هەندێك کەس کە ئەگەر بڕیار بێت رۆحی لیبرالیستی بپارێزرێت، پێویستە هەندێ هەمووارکردنی بێلایەن لە پرەنسیپی بێلایەنی سیاسیدا ئەنجامبدرێت، لە رێڕەوی کاردا. لە وانەیە روانگەی ((جان ستورات میل)) و ((کانت)) سەبارەت بە پۆلۆرالیزم و سەربەخۆیی کارکردن فەرامۆش بکرێن، ئەم باسەش لە هەلومەرجێکدا ئەنجامدەدرێن کە گرووپێك رابگەینێت کە پێویستە دەوڵەت لە ژیانی سیاسیدا، ئەلتەرناتیڤی جۆراوجۆر رەچاو بکات، بەچەشنێك کە هەندێکیان رێ پێدراو و هەندێکیان رێ پێنەدراو بناسێنیت. بەم پێیەش دەوڵەت ناتوانێت چاودێرێکی بێلایەن بێت، بەڵکو پێویستە لە بری ئەم کارە خەسڵەتی دەوڵەتی ئاکاری بۆ خۆی بەرجەستە بکات.

بە هەر حال پێویستە بزانین کە ئایا لە کۆمەڵگایەکی پۆلۆرالیزمیدا دەوڵەت دەتوانێت وەك چاودێریکی بێلایەن و بێ ڕا کار بکات و دەرفەت بدات شێوازە جۆراوجۆرەکانی ژیانی لەگەڵ یەکتردا بژین و لە هەمان کاتدا سەربەخۆیی تاکەکەس و یەکسانی بپارێزێت

هەڵبەت پێویستە بەپێی پۆلۆرالیزمی ئاکاریی سەربەخۆیی تاکەکەس روون بکەینەوە؟ بەم جۆرش ئەگەر تاکێك خاوەن چەندین جۆری هەڵبژاردنی پەسەندکراوی ئاکاری بێت، لەوکاتەدا ئەم کەسە دەتوانێت بەردەوامی بە ژیانی سەربەخۆیی بدات. بەم چەشنەش ئەگەر سەربەخۆیی کارکردن وەك ئارمانجێك هەژماربکرێت، لەم بارودۆخەدا پێویستە هەڵسوکەوتێکی ئاکاری لەگەڵیدا ئەنجامبدرێت.



**ئەنجامەکان:**

شیکردنەوەی رەهەندە جۆراوجۆرەکانی پۆلۆرالیزم بە پێی بگۆڕگەلی وەك ئازادی، سەربەخۆیی کارکردن، سەروەری، کەسایەتی راستەقینەی گرووپەکان و بوونی دەوڵەتی پۆلۆرالیزم، نیشاندەدات کە بەکار هێنانی لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا ئەنجامی جیاواز و هەندێ جار ناکۆکیشی لێدەکەوێتەوە کە لە هەلومەرجی وابەستە بوونی ئەم رەگەزانە بە فاکتەرەکانی دەرەوەی سیستەمی سیاسی بۆ پاساوهێنانەوەی کارکردەکانی، گرفتگەلێك دەخولقێنێت.

هەڵسەنگاندنەکانی دیموکراسی پەرلەمانی. ئەوە دەردەخات کە ئەو دامەزراوانەی تەنیا وەك تەکنیکی ئامرازییەکان دەردەکەون، ناتوانن بەشداریی چالاکانەی سیاسی گەرەنتی بکەن ئەمڕوکە بە سەختی دەتوانین تەقوای سیاسی کە مۆنشکیو ئاماژەی پێدەدا و بە فاکتەری سەرەکی خەڵك سالاری هەژمار دەکرد، لە کۆمەڵگاکانی رۆژئاوادا ببینین. راستی ئەوەیە کە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا هەوڵێکی ئەوتۆ بۆ نەهێشتنی ئەم کەم و کورییە نەدراوە و بە پێچەوانەوە زۆرێك لە باسە ئاکاری و فەلسەفییەکانی سەبارەت بە پۆلۆرالیزم پشت گوێ فراون. هەڵبەت پێویستە ئاماژە بدرێت کە بە ئێسکی زۆر لە ناتوانایی بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە، پەیوەستە بە گرفتە ستراکتۆرییەکانی سیستەمە لیبرال دیموکراسییەکان.

لە قۆناغەکانیتردا، بەکار هێنانی مۆدیلی هاوسەنگی بووبە هۆی ئەوەی کە خەڵك سالاری تەنیا بە کاروکردەوەیەك بۆ هەڵبژاردنەکان و دەسەڵاتبەخشین بە حکوومەتەکان بگۆڕێت. لەم مودیلەدا، لەگەڵ خەڵك وەك بەکاربەرانی بازاڕی سیاسی هەڵسوکەوت دەکرێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی گوێنەدانی سیاسی و کەم بوونەوەی بەشداریی خەڵك.

بڕوا هەبوون بە پۆلۆرالیزم پێویستی بە لێبوردەی سیاسی هەیە، ئەویش نەك تەنیا لە ئاستێکی نزمی نەتەوەییدا بەڵکو لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا. ئەزموونی ئەم ساڵانەی دوایی





ئەوە دەخاتەڕوو کە کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا تەنانەت لە ناوخۆشدا نەیانتوانیوە بە سازش و ڕێککەوتنێکی گشتی سەبارەت بە دان بە خۆ گرتن لە هەمبەر ڕەفتارە" جیاوازەکان " بگەن.

چونکە بەشێکی زۆر لە ئیمکاناتی ئابووری، سیاسی وکولتووریی لەدەست ژمارەیەکی کەمدان کە لە دەرەوەی کونترۆلی پرۆسەی دیموکراتیك و پۆلۆرالیزمانەدا کاردەکەن، بۆیە ئازادی تاك ڕووبەڕووی مەترسی بووەتەوە، تاڕادەیەك کەلە پراکتیکدا دانوستان لەنێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا پچڕاوە، بەڵگە نەویستە کە ئەمڕۆکە دیموکراسی پۆلۆرالیزمی پێکهاتەیەکی دژ بەیەك لە زنجیرە پرەنسیپێکی ئاشتی هەڵنەگری لەخۆگرتووە، بوونی ئەم دژ بەیەکیانە لە پۆلۆرالیزمدا دەربڕی قەیرانی جیددی و ڕیشەدار لە دەروونی دیموکراسی لیبراڵییە.



# بەشی پێنجەم

# نوێگەرایی سیاسی و وەرچەخانی کارگێڕیی





سیستەمی کارگێڕی، وێنەیەکی گشت کۆمەڵگایە کە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ ستراکتۆرە کۆمەڵایەتی، سیاسی، یاسایی و ئایدیۆلۆژیکی و ئابوورییەکاندا هەیە. ئەگەر بمانەوێت پەیڕەوی سەربەخۆ، خوێندنەوەی بۆ بکەین، بەلاینیکەمەوە، پێویستە جەخت لەسەر وابەستەی ئۆرگانیکی و دوولایەنەی پەیوەندییەکانی (تعاملات) نێوان ستراکتۆرەکان بکەینەوە. بەهەر حاڵ لە رەوتی وەرچەرخانی سیستەمی کارگێڕی ناکرێت سیستەمی کارگێری وەك بۆرێکی سەربەخۆ خوێندنەوەی بۆ بکرێت و هەر جۆرە وەرچەرخانێك بۆ بەرزکردنەوەی کارامەیی کارگێڕی و وەڵامدانەوەی پلانە سیاسییەکانی گەشەسەندنی ئابووری، کۆمەڵایەتی تەنیا لە خودی چوارچێوەی بەرتەسکی سیستەمی کارگێریدا. بدۆزینەوە بۆیە پێویستە پەیوەندییە دوو لایەنەی سیستەمی کارگێڕیی لەگەڵ ستراکتۆرەکانیتری کۆمەڵگادا شیبکەینەوە. چونکە هەر هەنگاوێکی سەرەکی  بە ئاراستە باشتر کردنی سیستەمی  کارگێڕی، بە جۆرێك لە جۆرەکان لەگەڵ سیستەمی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی پەیوەندی هەیە و لە هەمان کاتدا کارکردی گشت ستراکتۆرەکان دەتوانێت کاریگەری بەسەر کارامەیی و ناکارامەیی سیستەمی کارگێڕیدا هەبێت. چونکە موخریجاتی (OUT PUT) سیستەمی کارگێڕی بە کۆمەڵگا و ژینگەی سیستەمەوە پەیوەستە، بۆیە وەرچەرخان لە سیستەمی کارگێڕیدا لە بۆشاییدا ئەنجامنادرێت و دەبێ بە رەچاوکردنی بگۆڕە جۆراوجۆرەکان خوێندنەوەی بۆ بکرێت. بەم جۆرەش لە رێگەی مایکرۆ شیکردنەوەوە، دەتوانین ریشەیی لە سیستەمی کارگێڕیدا ئەنجامبدەین. کاتێك باس لە گەشەسەندن دەکەین پێویستە سەرەتا دڵنیا بین کە ئایا خودی سیستەمی کارگێڕی گەشەسەندنی پێویستی هەیە یان نا؟ سروشتییە، کاتێك کە خودی سیستەمی کارگێڕی کەم و کوڕی قووڵی هەبێت و ئیمکاناتی پێویستی نەبێت، چۆن دەتوانێت بەرپرسیارێتی گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە ئەستۆ بگرێت.

## نوێگەری و گەشەسەندنی سیاسی:

سەرەڕای ئەوەی کە زۆرجار گەشەسەندن و نوێگەری بە هاو واتای یەکتر بەکار دێن، بەڵام هەندێ لە توێژەران، گەشەسەندنی سیاسی، گشتگیرتر لە نوێگەری سیاسی هەژماردەکەن و لەو بڕوایەدان کە نوێگەری سیاسی لە دەروونی گەشەسەندنی سیاسیدایە و خەسڵەتەکانیشی هاوبەندی نێوان ستراکتۆرەکان و کارکردەکان بۆ داهێنان و نوێخوازی، بوونی ستراکتۆرگەلی کۆمەڵایەتی مەیلدار (انعطافیە)، بە پسپۆڕێتی بوون، بوونی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی تایبەت بۆ پەرەپێدان بە زانست لێهاتوویی بۆ ژیان لە جیهانی پێشکەوتووی تەکنولۆژیك دەزانن. بە بۆچوونی ئەوان دەتوانین نوێگەری سیاسی بە پرۆسەیەك هەژمار بکەین کە لە میانەیدا ڕۆڵە کارکردەییە ستراتیژیکییەکانی کۆمەڵگا هەوڵ بۆ بنیاتنانەوە و بەرهەمهێنان دەدەن.

هەندێکیتر لە زانایانی زانستە سیاسییەکان، نوێگەری بە ستراکتۆرە سیاسییەکانی جۆراوجۆر و بە پسپۆڕێتی بوو، هەروەها دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی بە سەر گشت بەشەکانی کۆمەڵگادا پەیوەند دەدەن. هەندێ لە توێژەران بە ڕوانگەیەکی پارێزگارانە بۆ گەشەسەندنی سیاسی و نوێگەریی، جەخت لە سەر بەهاگەلی وەك سەقامگیریی، هاوسەنگی و هەماهەنگی لە کۆمەڵگادا دەکەنەوە و بە دامەزراوەیی بوون بە پێویست دەزانن. بۆ نموونە سامویل هانتینگتۆن نوێگەری بە پێی ڕادەی بە پیشەسازی بوون، دینامیکییەت و ئامادەیی (تجهیز) کۆمەڵایەتی، بەشداریی سیاسی و بووژانەوەی ئابووری هەڵدەسەنگێنێت. بە بۆچوونی ئەو چونکە لە پرۆسەی نوێگەری و گەشەسەندنی سیاسیدا داواکاریگەلی نوێ بۆ بەشداریکردن و گێڕانی ڕۆڵی نوێ سەرهەڵدەدەن، بۆیە پێویستە سیستەمی سیاسی توانایی پێویستی بۆ گۆڕینی بارودۆخی بەرقەراری هەبێت. بە پێچەوانەوە سیستەم ڕووبەڕووی ناسەقامگیری، پشێوی، دەسەڵاتخوازی و هەرەسهێنانی سیاسی دەبێتەوە و لەوانەیە وەڵامدانەوەی کۆمەڵگا بۆ ئەم پشێووییە بەرەو شۆڕش کۆتا بێت.



بە بۆچوونی هانتینگتۆن هەر ئەندازە سیستەمێکی سیاسی لە سادەییەوە بەرەو ئاڵۆزی، لە وابەستەیی بەرەو سەربەخۆیی، لە نامەیلداری بەرەو مەیلدار بوون، لە پەرت و بڵاوی بەرەو یەکبوون هەنگاو بنێت، بەهەمان ئەندازە ڕادەی گەشەسەندنی سیاسی ئەم سیستەمە زیاد دەبێت. بێگومان کاتێك کە لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا خوێندنەوەی ئەم پێودانگانە دەکەین، دەبینین کە وەڵامی سیستەمی سیاسییە جیاوازەکان بەم پێودانگانە یەکسان نین، چونکە لەو ڕووەوە کە لە چوارچێوەی بەها خوێندنەوەی گەشەسەندن و نوێگەری سیاسی دەکرێت، بۆیە دەکرێ مەیلداربوونی زۆرتری سیستەمێك وەك ڕەفتارگەلی دژی گەشەسەندن و دژی بەشداری سیاسی هەژمار بکرێت. لە لایەکیترەوە ((لوسیان پای)) لە چوارچێوەی قەیران، خوێندنەوەی گەشەسەندن و نوێگەری سیاسی دەکات و لەو بڕوایەدایە کە دەرباز بوونی سەرکەوتوانە لە قەیرانەکان ڕێگە خۆشکەری گەشەسەندن و نوێگەری سیاسییە. پای شەش قەیران شیدەکاتەوە کە بریتین لە، قەیرانی شوناس، بەشداریی، دەسترۆیی، مەشروعییەت، دابەشکردن، یەکپارچەیی.

## وەرچەرخانی کارگێڕی و نوێگەریی سیاسی:

لە پرۆسەی نوێگەری سیاسیدا سیستەمی کارگێڕی ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت و خودی ئەم کارەش پێویستی بە گۆڕان و وەرچەرخان لە ناو خودی سیستەمی کارگێڕیدا هەیە. بۆیە لەم خوێندنەوەیەدا پێویستە هەڵسوکەوتی نێوان ئەم دوو پرۆسەیە ڕەچاو بکرێت. بە پێی خەسڵەتەکانی هەر سیستەمێکی سیاسی، ئەم سیستەمە ڕووبەڕووی زنجیرە داواکارییەك دەبێتەوە، پرس داواکاری و تێکۆشان بۆ دابینکردنی داواکارییەکان بەشێکی نەپچڕاوی هەر پێناسەکردنێکی سیستەمە. لەم ئاراستەیەدا بە پێی ئەوەی کە ئەم داواکارییانە لە لایەن چ گرووپگەلێکی کۆمەڵگا بەرز دەکرێتەوە، هەروەها وەڵامی چ گرووپگەلێك دەدرێتەوە، دەکرێ پۆلین بکرێن. ڕێکخراوە سیاسییەکانیش بەپێی چالاکییەکانیان و جۆری سەرقاڵ بوونیان و سەر بە چ

گرووپێکن، پۆلیندەکرێن. بەم پێیەش دەتوانرێت جۆری رێکخراو و چالاکییەکان لێك جیابکرێنەوە. هەندێ لەم گرووپە سیاسییانە لە رووی کاریگەر بوون بە سەر بڕیارە سیاسییەکاندا رۆڵی سەرەکییان هەیە.

سیستەمە سیاسییەکان رووبەڕووی هەموو جۆرە داواکاری و رێکخراو گەلێك دەبنەوە کە هەر یەکیان بەجۆرێك داواکارییان دەخەنەڕوو. توانایی هەر سیستەمێك بۆ وەڵامدانەوەی داواکارییەکانیان جیاوازە. هەر ئەندازە سیستەمی سیاسی توانایی زۆرتری بۆ گێڕانی رۆڵی جۆراوجۆری هەبێت، بە هەمان ئەندازە توانایی ئاراستەکردن و پەرەپێدان بە ئامانجگەلی سەربەخۆیانەی هەیە. ئەمەش بەرفراوان کردنی پانتای سیاسەت و خزمەتگوزاری کارگێڕی بۆ گرووپە جۆراوجۆرەکانی لێدەکەوێتەوە.

سیستەمە سیاسییە جۆراوجۆرەکان لە رووی مامەڵەکردن بە وەرچەرخان و گۆڕانکارییە ((چاوەڕوان نەکراوە)) توانایی و لێهاتوویی یەکسانیان نییە. توانایی شاردراوە (بالقوە) بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ جۆرەنوێیەکانی داواکارییە سیاسییەکان تەنیا لە هەلومەرجێکدا فەراهەم دەبێت کە سیستەمی قۆناغی نوێگەری سیاسی تێپەراندبێت. تایبەتمەندییەکانی نوێگەری سیاسی بریتین لە:

١- ئاستێکی بەرزی جۆراوجۆری (تنوع) لە رۆڵ و دامەزراوە سیاسییەکاندا.
٢- پەرەسەندنی چالاکی رێکخراوە کارگێڕی و سیاسییە ناوەندییەکان و پەرەپێدانی لەسەرخۆی ئەم رێکخراوانە لە گشت کەرت و بەشەکانی کۆمەڵگادا.
٣- مەیل بۆ خێراتر بەخشینی هێزی شاراوە بە گرووپەکانیتر و دابەشکردنی بەسەر گشت هاوولاتیاندا.
٤- مەشروعییەت بوونی نوخبە سوننەتییەکان و رەوتی روو لە زیاد بوونی بەرپرسایەتی ئایدیۆلۆژیکی و جێگیرکراوی سەرکردە سونەتییەکان لە هەمبەر هاوڵاتیان کە هێزی شاراوە (بالقوە) یان هەیە.
٥- سەربەخۆ بوونی رێکخراوە ناحکومییەکان لە کارکردندا.



ئەم پێش مەرجانەی سەرەوە گرێدراو بە پشتگیری بەردەوامی سیاسییە، هەروەها پێویستی بە نەهێشتنی وەفاداری سیاسی دامەزراوە لەسەر خزمایەتی و گواستنەوەی بۆ وەفاداری بە گرووپە نوخبەکانی هەیە. کەم بوونەوەی پابەندی خزمایەتی، سەرکردەکان ناچار دەکات تا بە بەردەوامی هەوڵی بەدەستهێنانی پشتگیریی هاوولاتیان بدەن تا بەم جۆرەش سەرکەوتنیان لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی بەردەوام و کاریگەر جێگیر بکەن.

سەر لە نوێ دابەشکردنی دەسەڵات لە تایبەتمەندییەکانی نوێگەری سیاسی هەژمار دەکرێت، چونکە بە پێچەوانەوە بەشداریی سیاسی کە لە پێداویستییە سەرەتاییەکانی گەشەسەندنی سیاسی هەژمار دەکرێت، مانای نامێنێت. لە هەلومەرجی نەبوونی نوێگەری سیاسیدا، نوخبە سیاسییەکان لە سەرهەڵدانی رێکخراوە خۆبەخشەکان دەترسن و هەوڵدەدەن کونترۆڵی پرۆسەی خستنە رووی داواکارییەکان و گەڵاڵەکردنی خواستەکان بکەن. بەم پێیەش نوخبە سیاسییەکان هەوڵی دامەزراندنی رێکخراو گەلێك دەدەن تا داواکارییە پەرت و بڵاوەکان کونترۆڵ بکەن.

لە پرۆسەی سەرلە نوێ دابەشکردنی دەسەڵاتدا، ستراکتۆرە کارگێڕی و سیاسییەکان بە جیاواز لە یەکتر بەڵام لە هەمان کاتدا پێکەوە گرێدراو دەکەونە ژێر کاریگەریدا. چونکە ئەم پرۆسەیە تەنیا وەرچەرخان لە سیتەمی کارگێڕیدا لەخۆ ناگرێت، بەڵکو ئاستە جۆراوجۆرەکانی بڕیاردان لە چوارچێوەی ستراکتۆری سیاسیدا لەخۆ دەگرێت. بەم جۆرەش یەکێك لە دەرهاویشتەکانی پرۆسەی سەرلەنوێ دابەشکردنی دەسەڵات کە بە نامەرکەزی بوونی کارگێڕی گەڵاڵە دەکرێت. کاریگەری بەسەر گشت سیستەمدا دەنوێنێت.

کارامەیی سیستەمی سیاسی نەتەنیا بە سیاسەت و شێوازە گەشەسەندووەکان لە ناوەندا پەیوەستە. بەڵکو پەیوەستە بە نموونەی (نموذج) هەڵسوکەوتی دەوڵەت لە بەرفراوانکردنی خزمەتگوزارییەکان بۆ گشت ناوچەکان بە گشتی ئاسەوارەکانی ناوەند

گەرایی کارگێڕیی، لە کەم بوونەوەی داهێنان، بەشداری نەکردن، بە فیڕۆدانی هێزی مرۆیی و لە ئەنجامدا وەڵام نەدانەوەی سیستەمی کارگێڕی بە داواکارییە سەرەتاییەکانی خەڵك بەرجەستە دەبێت و لەمپەر لە بەردەم بووژانەوەی خێرای ئابووری و کۆمەڵایەتی دروستدەکات. چونکە بەدیهاتنی پلانە خێراکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی پێویستی بە بەشداریکردنی بەرفراوانی گشت ئاستە کارگێڕی و رێکخراوەییەکانی هەیە.

ناوەندگەرایی کارگێڕی و بە گشتی ناوەندگەرایی دەسەڵات و سەرلەنوێ دابەش نەکردنەوەی دەسەڵات، بێلایەن کردن و وەرگرتنەوەی بەرپرسیارێتی زۆرێك لە کارتەکانی لێدەکەویتەوە و یەکێك لە ئاسەوارە سەرەکییەکانیش ناتوانایی سیستەمی کارگێڕی لە وەگەڕخستنی هێزی پسپۆڕە. بەم چەشنە پێویستی لە رێگەی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی دەسەڵات گرفتی سیاسییانەی ناوەندگەرایی کارگێڕی چارەسەر بکرێت. واتە لە رێگەی گواستنەوەی دەسەڵات بۆ ناوچەکان، ئەم ناوچانە لە تەنیا جێبەجێکاری بڕیارەکانی ناوەند بۆ فاکتەرگەلی سەرەکی بڕیاردان و بەشداریکردن لە پرۆسەکانی پلاندانانی ئابووری و کۆمەڵایەتی بگۆڕدرێن. هەڵبەت ئەم کارەش پێویستی بە زانیاری بەخشین و لێهاتوویی و نەبوونی بزاڤگەی رەتکرنەوەی ناوەندە. چونکە هەر وەك پێشتر ئاماژە پێکرا یەکێك لە خسڵەتەکانی گەشەسەندنی سیاسی و کارگێڕی فرە ستراکتۆری و جۆراوجۆری رۆڵەکانە و لە پاڵ ئەمەشدا پێویستە بگۆڕرەکانیتر رەچاو بکرێت کە ئەمەش بریتییە لە سەربەخۆیی ستراکتۆرەکان لە کارکردن و هەبوونی دەسەڵات لە بڕیار دەرکردندایە نەك ئەوەی کە گشتیان رادەربڕی بۆرۆکراسی دەسەڵاتداربن.

یەکێك لە پرسە گرنگەکانی پەیوەست بە پرسی ناوەندگەرایی رێکخراوەیی، پرسی تاکگەرایی لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسیدایە، بە واتایەکیتر هەندێ جار "ئەقلی تاکی" لە سەرووی "ئەقلی گرووپی" دایە و لە کۆتادا تاك بە بڕیاردەری سەرەکی هەژمار دەکرێت.



هەندێ جار پاڵنەرە کولتوورییەکان دەبنە هۆی ئەوەی کە بڕیار دەرکردن لە دەست کەسانێکی کەم بێت و بەڕێوەبەرە پلە بەرزەکان رێکخراو و لە ترسی لە دەستدانی دەسەڵات و سەرکەوتنەکەیان، تەنانەت لە بەر ئەوانیتر سپاردنی بڕیاردانی کەم بایەخ خۆ پەرێز بن، ئەم جۆرە ناوەندگەراییە بێ بایەخە دەبێتە هۆی بێ رۆڵ کردن، گوێ نەدان و بەشداری نەکردن ژمارەیەکی فراوانی رێکخراوە کارگێڕییەکان.

چوونە ناو پرۆسەی نوێگەری پێویستی بە نا ناوەندگەرایی واتە دیموکراتیزە کردنی سیستەمی کارگێڕی هەیە. بەگشتی لە نێوان دیموکراتیزە کردنی سیستەم و ناوەندگەرایی کارگێڕی ناکۆکی هەیە. بە واتایەکیتر نا ناوەندگەرایی هەنگاوێکە بە ئاراستەی بە جەماوەریکردنی سیستەمی سیاسی.

بە هەر حاڵ پێویستە سیستەمی سیاسی سەرەڕای هەبوونی توانایی پێویست بۆ گۆڕانکاری کردن بە ئاراستەی داواکارییەکانی ژینگەی سیستەم، دەسەڵات و توانایشی بۆ وەرچەرخانی ستراکتۆرەکانی بە تایبەتیش سیستەمی کارگێری هەبێت. بە گشتی لە کۆمەڵگا مودێرنەکاندا پەیوەندییەکی نزیك لە نێوان فەراهەم بوونی سەرچاوەکان بۆ نوخبە سیاسییەکان و کەناڵەکانی خستنەڕووی داواکاری و چالاکییە سیاسییەکان هەیە.

مێژووی سیستەمە سیاسییە هاوچەرخەکان پڕە لە بابەتگەلی خۆگونجانی ناسەرکەوتوو یاخود نەبوونی خۆگونجانی ستراکتۆرە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ داواکارییە نوێیەکاندا. توانایی سیستەمە سیاسییە هاوچەرخەکان بۆ راکێش کردنی وەرچەرخان لە داواکارییەکاندا پەیوەندی راستەوخۆی بە گەشەسەندنی فرە لایەنەی دامەزراوەییە. لەم رەوتەدا پێویستە ئاماژە بکرێت بە نوێگەری دامەزراوەگەلی یاسادانان و جێبەجێ کردن و گشت دامەزراوەکانی رادەربڕین و کۆ کردنەوەی داواکاری و خواستەکان.

بۆرۆکراسییەکان رۆڵی سەرەکییان هەیە لە فۆرم دان بە چوارچێوەی سیستەمە فرە (تنوع) بووەکان و بە ئامرازی گرنگی یەکپارچەیی و یەکگرتوویی سیاسی و نوێگەری سیاسی هەژمار دەکرێن. هەروەها خودی رێکخراوە کارگێڕییەکانیش بە فاکتەری





هێزی کردنی نوێگەری هەژمار دەکرێن. لە ڕێگەی کارکرد و توانایییەکانی بۆرۆکراسییەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تا چ ئاست کۆمەڵگا ئامادەیی بۆ وەرچەرخان و گۆڕانکاری سیاسی هەیە.

لە خوێندنەوەی سیستەمە کۆلۆنیالکارەکانی پێشوودا دەبینین کە دام و دەزگا حکوومییەکان ڕۆڵی سەرەکییان لە نوێگەریدا هەبووە. لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا، گەشەسەندنی سەرەتاییانەی بۆرۆکراسییەکان بە ئاراستە دابینکردنی پێداویستییەکانی هێزە کۆلۆنیالکارەکان بۆ پاراستنی دیسپلین بووە. لە لایەکەوە ئەم بۆرۆکراسییانە یارمەتی فەراهەم کردنی چوارچێوە جێگیر بووە یاسایی و کارگێڕییەکانی داوە و لەلایەکیترەوە هەوڵدراوە کە ئاستی بەرزدا بە ناسیاسییانە بمێنێتەوە و دەست لە کاروباری سیاسیدا وەرنەدات. بەردەوام ئەم بۆچوونە کە پێویستە لە ڕووی سیاسییەوە دامودەزگا کارگێڕییەکان بێ لایەن بن، بەهێزتر دەبوو. لەم ئاراستەیەدا دەبینین کە کۆلۆنیال گرووپە سیاسییەکان و ڕای گشتی ڕەچاو نەکردووە و هەر بۆیەش هەوڵدراوە بۆرۆکراسی لە چوارچێوەیەکی داخراودا کاربکات. هەندێ جار کارکردی دامودەزگا کارگێڕییەکان تەنیا ئەنجامدانی کاری ناسەرەکی بوو.

دووەمین ئاست لە بۆرۆکراسییەنوێیەکاندا و پارتیمان و چینگەلێك لە خۆوە دەگرێ کە دوای بەدەستهێنانی سەربەخۆیی گەشەیان کردووە. ئەم بۆرۆکراسییانە نییە و یەکێك لە فاکتەرەکانی دامەزراندنیان بەشداری کردنیان لە بزاڤە سیاسییە ناسیۆنالیستییەکاندا بووە. بۆرۆکراسییە نوێیانە ئەرکی پێشکەوتنی ئابووری، باشترکردنی بارودۆخی پەروەردە و پلانگەلی گەشەسەندنی کۆمەڵگایان لە ئەستۆدا بوو.

زۆربەی ئەو بۆرۆکراتانەی کە لەم بۆرۆکراسییە نوێیەدا کاریان دەکرد لایەنگری سیاسی ئاشکرایان هەبوو و زۆرتر لە قۆناغی کۆلۆنیال بەرپرسیارێتی سیاسییان هەبوو. زۆرجار ئەم بۆرۆکراتانە خۆیان بە نوێنەری بزاڤ، گرووپ و پارتە سیاسییە جوراوجۆرەکان دەزانی، بەگشتی زۆربەی ئەم فەرمانبەرانە ئەرکەکەیان بە سیاسی هەژمار دەکرد. هەربۆیەش هەڵسوکەوتیان زۆرتر سیاسی بوو تا کارگێری.



لە نێوان بۆروکراسی کۆن و چینە نوێیە کارگێڕییەکانی پەیوەندی ئاشتییانە بوونی نەبوو، بەتایبەتیش لە سەرەتاکانی سەربەخۆیی ئەم گومان و متمانە پێ نەکردنە لە نێوان بۆرۆکراتە ناسیۆنالیستییەکان و فەرمانبەرە بەجێما وەکانی سەردەمی کۆلۆنیال زۆرتر دەبینرا.

خەسڵەت و کارکردی ئەو بۆرۆکراسییانەی کە لە ژێر کۆنترۆڵی حکوومەتی کۆلۆنیالدا نەبوون، سەرەڕای بوونی خاڵی هاوبەش، بەڵام دۆخی جیاوازیان هەبوو. هەندێ لەم بۆرۆکراسییانە تا کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی پانتای سیاسییان کۆنترۆڵ دەکرد. ستراکتۆری کارگێڕی زۆرێك لەم سیستەمانە تێکەڵێك لە ڕەگەزگەلی تەقلیدی و مودێرن بوو و هەندێ جاریش لاسایی کردنەوەی سیستەمی ئەورووپی بوو.

هەندێ لەم سیستەمە کارگێڕییانە، ڕەچاوی بەرژەوەندیی ئۆلیگارشی دەسەڵاتداری دەکرد و لە هەمان کاتیشدا خاوەن زنجیرە ئامانجگەلی کۆمەڵایەتی و ئابووریش بوون. ئەگەر چی سەرەتا نوێگەری لە بوارەکانی سەربازی و پەروەردەدا کورت دەکرایەوە بەڵام هێدی هێدی بەرەو بوارەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی پەلکێشی کرد و ئەمەش پانتای چالاکییەکانی بۆرۆکراسی لە ڕووی لە ئەستۆ گرتنی بەرپرسیارێتی نوییێ، فراوانتر کرد. بە هاتنە ناوەوەی هێزی مرۆیی نوێ بۆ دامەزراوە حکوومییەکان، ڕۆحێکی تازە بە سیستەمی کارگێری بەخشرا.

لە هەندێ وڵاتی وەك مەکزیك، پارتە ڕێکخراوە نیمچە شۆڕشگێڕییەکان توانییان ئۆلیگارشی دەسەڵاتدار برووخێنن و چوارچێوەیەکی سیاسی سەقامگیر دابمەزرێنن. بەگشتی لە گشت کۆمەڵگاکاندا جا مێژوویی بن یان نوێ، بۆرۆکراسی لە دەست نوخبە سیاسی و گرووپە سەرەکییەکاندا بووە، لە نێوان نوخبەگەلێك کە هەوڵی داوە لە ڕێگەی بۆرۆکراسییەوە پێداویستی و ئامانجەکانی دابینبکات و بەڕێوەبەر گەلێك کە هەولێان داوە سەرچاوە ئابوورییەکان و پشتگیری سیاسی بۆ نوێگەری موبیلیزە بکەن.

لە هەمبەر گوشارە جۆراوجۆرەکاندا، ئاستە بەرزەکانی بۆرۆکراسی حەز لە پەرەپێدان بە هەندێ لە خەسڵەتە دامەزراوەیی و ئاراستە سیاسییەکانی خۆی دەکات





و سەرەکیترین ئەم حەزانەش لە جەخت کردنە سەر دامەزراوە ناوخۆیی و سەربەخۆی لە کارکردندا دەبینرێت. لەم رەوتەدا زۆرجار هەوڵدەدرێت تا داواکاری و بەرژەوەندییەکان لێك نزیك بکرێنەوە، و سەرەڕای بەرگری کردن لە هەمبەر گوشارە دەرەکییەکان رەچاوی بەرژەوەندیی بۆرۆکراتەکان بە خزمەتکاری خەڵك بناسرێن.

هەندێ جار بۆرۆکراتەکان خۆیان بە کەسانێك دادەنێن کە لە هەمبەر دەزگای کارگێڕیدا بەرپرسیارن، و بۆیەش بە جەخت کردنە سەر رێساکان لە بری پەیوەندییەکان پابەندی پیشەکانیان دەبنەوە، گشت ئەم مەیلانە دەکرێ تێکەڵ بە جۆرەکانی ستراکتۆری رێکخراوەیی ببێتەوە. بەهەر حاڵ زۆرێك لەم دامودەزگایانە گشت خەسڵەتە کارگێڕییەکانی ((ڤێبر)) یانەیان بە دەست نەهێناوە. لە رووی گونجانەوە خەسڵەتەکانیان لەگەڵ مودیلی ((ڤێبر)) خاڵ بە خاڵ جیاوازن.

شایانی ئاماژە پێدانە کە ئەم خەسڵەتە رێکخراوی و کارگێڕیی لە بۆشاییدا دەرناکەون بەڵکۆ لە ئەنجامی بارودۆخی کۆمەڵایەتین. بە هۆی ئەم بارودۆخەشەوە بۆرۆکراسییەکان لە رووی خەسڵەتی رێکخراوی، هەر لەسەرەتاوە خاوەن کارکردی بەرفراوانی کۆمەڵایەتی و سیاسی بوونە و لە پرۆسەی سیاسیدا بەشدارییان کردووە.

گشت ئەم تایبەتمەندییانە بووە هۆی ئەوەی کە سیستەمی کارگێڕی ئەنجامدانی زنجیرە کاروبارێك لە دەزگای حکوومەتدا ئاسان بکات. گرنگترین ئەم کاروبارانە بریتین لە:

- یەکپارچەیی سیستەم.
- بوونی توانایی پێویست بۆ وەرگرتنی داواکارییە جۆراجۆرەکا.
- بوون بە ئامرازگەلی گرنگ بۆ هێنانەدی ناوەندی ناوەندگەرایی (تمرکز) و یەکپارچەیی.
- یارمەتیدانی نوخبە سیاسییەکان بۆ سیاسەت داڕێشتنی بەردەوام.
- یارمەتیدان لە مۆبیلیزە کردنی سەرچاوەکان (باج و هێزی مرۆیی) و پشتگیری سیاسی.



- بوونی دامودەزگای بەردەوامی کارگێڕی و تاقمگەلی پرۆفشنال تیایدا، کە سەر بە خۆ لە گرووپ بەندییەکان کار دەکەن، دەتوانن یارمەتیدەری پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری تەکنیکی و ئاسانکاری بۆ گشت خەڵك بن و متمانەی گشتی راکێش بکەن.

سیستەمی کارگێڕی دەتوانێت، سەرەڕای بوونی ناکۆکی شاراوە (بالقوە) لە نێوان گرووپە سەرەکییەکانی کۆمەڵگادا، لە پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری بەردەوام دڵنیایان بکاتەوە و بەبێ رەچاوکردنی گۆڕانکارییەکانی دەسەڵات لە نێوان ئەم گرووپانەدا، پارێزگاری لە مافەکانیان بکات. هەروەها سیستەمی کارگێڕی دەتوانێت یارمەتی بەرێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان قەڵەمڕەوی سیاسی، نوخبەکان و گشت گرووپەکانی کۆمەڵگا بدات و بە مۆبیلیزە کردنی سەرچاوەکان لە پرۆسەی نوێگەری و بەشداریی سیاسی یارمەتی سەرکردە سیاسییەکان بدات. لە درێژخایەندا ئەم رەوتە، بۆرۆکراسی لە ململانێی سیاسی و بە سیاسی بوون دوور دەخاتەوە بەم جۆرەش لەم چەشنە بارودۆخەدا بۆرۆکراسی دەتوانێت لە رێگەی رازیکردن داواکارییە دژ بە یەکەکانی کۆمەڵگا و دابین کردنی پێداویستی توێژەکان، لە گوشارەکانی سەر نوخبەی سیاسی کەم بکاتەوە. لەم ئاراستەیەدا سیستەمی کارگێڕی نەتەنیا گیرۆدەی پرسە سیاسییەکان و بە سیاسی بوون نابێتەوە، بەڵکو تەنگژە کۆمەڵایەتییەکانیش کەم دەکاتەوە و سەرەڕای مەشروعییەت بەخشین بە سیستەمی سیاسی دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی بەشداری سیاسی.

بە پێی بابەتەکانی سەرەوە سیستەمی کارگێری لە پرۆسەی بەکومەڵگابوونی سیاسی ئەرکی گرنگ لە ئەستۆ دەگرێت. لەم پرۆسەیەدا دەزگای کارگێری سەرەڕای فەراهەم کردن و دابینکردنی پێداویستی گرووپە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا، ئەم گرووپانە بە دامەزراوەگەل و ئاشنا دەکات. لەم رێگەیەوە سیستەمی کارگێری سەرەڕای بەرزکردنەوەی توانایی سیستەمی سیاسی بۆ راکێش کردنی گشت جۆرە





داواكارییە سیاسییەكان، دەبێتە هۆی بەرزكردنەوەی تواناییەكانی لە مامەڵە كردن لەگەڵ گشت جۆرە داواكارییەكاندا.

لە سیستەمە تەقلیدییەكاندا، دامودەزگای دەوڵەتی سەرەڕای فەراهەمكردنی سەرچاوەكانی پێویست بۆ نوخبە سیاسییەكان، بەشداریی لە ڕێكخستن و جێبەجێ كردنی سیاسییەكان دەكەن و هەندێ جاریش لەگەڵ گرووپە چالاكەكانی وەك ئۆرسیۆكراسی و نوخبە ئایینییەكان، بەشداری لە ململانێتی سیاسیدا دەكەن. هەڵبەت لە سیستەمە تەقلیدییەكاندا زۆرێك لە بەرژەوەندیی و خواستەكان نەخراونەتەڕوو و لە شێوە سیاسییەكاندا جێ ناگرنەوە، چونكە زۆرینەی خەڵك لە پرۆسەی كۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسیدا بەشداری ناكەن زۆرجار لە قۆناغی پێش نۆێگەریدا، بۆرۆكراسییەكان دەتوانن، داواكارییەكان بوونی سیاسیدا، بە ئاراستەی خوگرتنی گرووپە جیاوازەكان لە چوارچێوەیەكی گشتی و دەزگایەكی سیاسیدا گرتوو كە ئەم كارەش مەشروعییەتی سوننەتی بە سەركردەكان دەبەخشێت و چوارچێوەی كۆمەڵایەتی دەپارێزێت.

لە قۆناغی نوێگەری سیاسیدا، بۆرۆكراسییەكانی زۆرتر لە پرۆسەی سیاسیدا بەشدارن، ئەم دامەزراوانە لەم قۆناغەدا، بەشداریی بۆ گرووپگەلی بەرفراوان لە پرۆسەی سیاسی و لە ئاستێكی بەرزدا دەرەخسێنن. ئەوان یارمەتی زۆر بە مەشروعییەت بەخشین بەو سەركردانەی كە خاوەن بنەمای تەقلیدی نین، دەدەن، ئەم دەستێوەردانەی بۆرۆكراسی لە پرۆسەی سیاسیدا بە چەندین شێوە دەبینرێت:

١- لە هەندێ وڵاتان بۆرۆكراسییەكان لە دیاركردن و جێبەجێ كردنی ئامانجەكان و ڕێبازی گشتی (حكوومەت) ڕۆڵی سەرەكی دەگێڕن و تەنیا دامەزراوە گەلێكن كە دەتوانن ئامانجە كارگێڕی و سیاسییەكان ڕێكبخەن.

٢- هەندێ جار سیستەمی كارگێڕی بە كەناڵێكی سەرەكی بۆ تێكۆشانی سیاسی هەژمار دەكرێت و ڕۆڵێكی كارای لە كۆ كردن و دەربڕینی داواكارییەكانی هەیە.



٣- هەندێ جار سیستەمی كارگێڕی بە بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ یەكێتییەگەلێك و گرووپە ئۆلیگاریشییەكان وەك گرووپی گوشار و خاوەن بەرژەوەندی كار دەكات.

بەم جۆرە دەبینین كە بە زیاد بوونی دەسەڵاتی سیستەمی كارگێڕیی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا دەشێ بۆرۆكراسی كاركردن فرە لایەنی هەبێت و ڕۆڵی پارتە سیاسییەكان (كۆ كردنەوەی بەرژەوەندییەكان و گۆڕینی داواكارییەكان بۆ سیاسەت) و یاسادانان و جێبەجێ كردنی بڕیارەكان لە ئەستۆ بگرێت. لەم كاتانەدا، بۆرۆكراسی دەبێتە سەنتەری هەموو چەشنە چالاكیگەلی سیاسی. ئەم بارودۆخەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە دامەزراوەكانیتر خاوەن كاركردی ڕاستەقینە نەبن و هێدی هێدی ڕۆڵەكەیان لە دەست بدەن. لەم كاتەدا قۆرغكەرایی بۆرۆكراسی ڕەوتی فرە ستراكتۆریی هێدی دەكات و لەهەمبەر ڕۆڵ گێڕانی سەربەخۆیانەی دامەزراوەكانیتر بەربەست دەنوێنێت. بەواتایەكیتر گشت ئەم خەسڵەتانەی كە ئاماژە بۆ كران، دوو تەوەر لە خەسڵەتەكانی نوێگەری سیاسی كە بریتین لە فرە ستراكتۆریی و سەربەخۆیی كاركرد و دامەزراوەكان، لە سیستەم دەسێنێتەوە. دەكرێ لەم ڕەوتەدا بۆرۆكراسی بە ئامرازی سەرەكی وەرچەرخانی كۆمەڵایەتی و بە كۆمەڵگا بوونی سیاسی هەژمار بكرێت. شایانی روون كردنەوەیە كە لە زۆربەی وڵاتانی لە دۆخی گەشەسەندنی بۆرۆكراسیدا تەنانەت لەو هەلومەرجانەی كە ئەركەكانی لە جێبەجێ كردنی سیاسەتەكان كورت دەكاتەوە، كارامەیی ئەوتۆی نییە. سوشتەكە بە بەرفراوان بوونی پانتان ئەركەكانی بۆرۆكراسی، نە دەتوانێت ڕۆڵی جێبەجێ كردن بگێڕێت و نە ڕێبازی (گشتی حكوومەت) دیار بكات. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە سیستەمی كارگێڕی توانایی وەڵامدانەوەی نەمێنێت. هەڵبەت ئەگەر بێتو سیستەمی كارگێڕیی لەسەر بنەمای لۆژیكی و عەقڵانی دامەزرابێت و كارامەیی پێویستی هەبێت، دەكرێ وەها چاوەڕوان بكرێت كە لە گێڕانی ڕۆڵە سیاسییەكەشیدا سەركەوتوو بێت. چونكە لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەم كە خەڵك ئاراستەگیری جۆراوجۆریان هەیە و





ستراکتۆرە تەقلیدییەکانیشیان وەك خێزان بەرفراوانە، بەشێکی زۆری پەیوەندی نێوان تاکەکان لە ناو گرووپە تەقلیدییەکاندا دادەمەزرێت. لەم کۆمەڵگایانەدا بە پێی پەیوەندییە کەسییەکانەوە، ئەرك و مافەکان پێناسە دەکرێن. لەم بارودۆخەدا پەیوەندی خەڵك بە رێکخراوە حکوومەتییەکانەوە چوارچێوەیەك بۆ پرۆسەیەکی بەرفراوانی بە کۆمەڵگا بوونی سیاسی فەراهەم دەکات. بە زیاد بوونەوەی رۆڵ و کارکردی بۆرۆکراسییەکان، سیستەمی کارگێڕی لە سەرووی رۆڵە پسپۆرییەکانی خۆی کاردەکات و دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم دامەزراوانە بە رووبەرێکی فراوان و هەڵسوکەوتی خەڵك بگۆڕن.

بە بۆچوونی زۆرێك لە توێژەران گەشەسەندنی سیاسی و نوێگەری سیاسی بریتییە لە بەرزبوونەوەی کارامەیی لە پەیوەندییەکانی دەسەڵاتدا کە ئەم بارودۆخەش لە چوارچێوەی مەشروعییەتدا گەڵاڵە دەبێت. لەم ئاراستەیەدا وەها وێنا دەکرێت کە لە پرۆسەی نوێگەری سیاسیدا، پانتای کاری حکوومەت زۆر دەبێت. بەڵام ئەمەش بەو مانایە نییە کە خودی وەرچەرخان لە سیستەمی کارگێڕیدا پانتای کاری حکوومەت بەرفراوان دەکات. بە بۆچوونی ئەم توێژەرانە گەشەسەندنی کارگێڕی پێش مەرجی گەشەسەندنی سیاسییە. چونکە لە سیستەمێکی گەشەسەندوودا چالاکییە سیاسییەکان پێویستی بە پلان دانانی ورد، دامەزراوەی کارامەتر، سەرچاوەی زۆرترو شارەزایی تەکنیکی تایبەتی هەیە. لێرەدا بۆرۆکراسی لە رووی پانتا، پسپۆرێتی، دابەشکردنی پرۆڤشناڵ بوون رەهەندی بەرفراوان لە خۆ دەگرێت ئەگەرچی پێویستە گەشەسەندنی سیاسی، ئابووری، کارگێڕی لە یەك کاتدا ئەنجامبدرێت، بەڵام هەندێ جار یەکێکیان وەپێش ئەوانیتر دەکەوێت بەم پێیەش بۆ بەدیهاتنی دیموکراسی پێویستە گەشەسەندنی ئابووری لە پێش گەشەسەندنی سیاسی بێت. ئەمەش لە کاتێکدایە کە هەندێ لە توێژەرانی زانستە سیاسییەکان لەو بڕوایەدان کە بۆ نموونە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گەشەسەندنی کارگێڕی دەتوانێت لە پێش گەشەسەندنی ئابووری و سیاسی بێت.



زۆرێك لە پرۆسەکانی گەشەسەندنی کارگێڕی بەندە بە سەرهەڵدان و زیاد بوونی دامەزراوە بۆرۆکراتیکییەکان، سەرهەڵدانی هەندێ بۆرۆکرات (وەك ئەفسەرانی سوپا) و کاربەدەستانی کارگێڕی وڵات زۆرتر دەربڕی نموونەگەلی سیاسین نەك وەرچەرخانی کارگێڕی لە راستیدا. ریشەی واتای ((بۆرۆکراسی)) کە لە چوارچێوەی کار بەدەستانی کارگێڕیدا دەخرێتەڕوو، زۆرتر دەربڕی حکوومەتی کاربەدەستانی کارگێڕییە کە خاوەن رۆڵی سیاسین، نەك رۆڵێکی کارگێڕی رووت. لەم چوارچێوەیەدا بۆرۆکراسی وەك رێکخراوێکی عەینی پێکهاتوو لە رۆڵی پێکەوە گرێدراوە کە بە پێی سیستەمی پلەی (سلسلە مراتب) فەرمی بۆ دامەزراوەیەکی بەرفراواتنر (حکوومەت) کاردەکەن. ئەو کەسانەی ئەم رۆڵە لە ئەستۆدەگرن. خاوەن کارکردی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کارگێڕی، سیاسی و ئاینین. ئەوەی کە زۆرتر ئێمە رەچاوی دەکەین رێژەی بەشداریکردنیان لە پرۆسەی کارگێڕیدایە.

لێرەدا پێویستە بزانین مەبەستی ئێمە لە کارکری کارگێڕی چییە؟ ئەگەر لایەنە شیکارییەکانی ستراکتۆرێك بە بنەما لە قەڵەم بدەین نەك بە سیستەمێکی عەینی، بەم جۆرەش پێویستە هەڵسوکەوتی گرووپ و رێکخراوەکان لە چوارچێوەی دامەزراوە فەرمی و نافەرمییەکاندا بخوێنێتەوە. بە گشتی ئەو کەسانەی کە لە چوارچێوەی سیستەمی کارگێڕیدا بڕیار دەردەکەن. پێویستە ناوەڕۆکی ئەم بڕیارانە و بەدوا هاتەکانیش بزانن. لەوانەیە ئەم بڕیارانە پانتایەکی بەرتەسکی بەهاکان بۆ خۆ تەرخان بکەن یاخود هەر خودی خۆیان بەها بن. هەڵبەت ئەم ئەگەرەش لە ئارادایە کە بڕیارێك لە یەك کاتدا هەم کارگێڕی بێت و هەمیش سیاسی. بڕیارێك لە کاتێکدا سیاسییە کە پرسی هەڵبژاردن (خیار) لە نێوان بەها رکابەر و دژ بە یەکەکان گەڵاڵە دەکات، کاتێکیش کارگێڕییە بە ئەنجامدانی ئامانجێك کە پێشتر دیارکراوە یارمەتی بدات. ئەگەرچی دەکرێ لایەنێك بە سەر گشت لایەکانیتردا زاڵبێت، بەڵام بە گشتی بڕیارەکان خاوەن قورسایی کارگێڕی و سیاسین. ئابووری، بە هەر حاڵ هەر بڕیارێك کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلێك دەربکرێت، بە سەر زنجیرە بەرپرسیارێتییەك دابەش





دەبێت ئەگەر بێتو هەلومەرج بە ئاراستەی هەڵبژاردنگەلی بەهای (خيارات القيمه) بن، سەپاندنی هێزی لەگەڵدایە. لێرەدا لایەنی کارگێڕی بڕیارەکان بە ئاراستەی زنجیرە بەرپرسیارێتی نۆرماتیڤانە پێناسەکراوە. رەهەندی سیاسی بڕیارەکان لە ململانێتی دەسەڵاتییانەی دوو یەکەی بڕیاردان هەڵدەقوڵێت شیکردنەوەی بڕیارەکان پێویستی بە تێگەیشتنێکی دروست لە ستراکتۆری بڕیاردان، بەشداربووان لە بڕیارداندا، هەلومەرج و پێویستییەکان. ئەلترناتیڤەکان، دروست لە رووداوەکان، رێژەی دەسەڵات، هەیە. لەم رەوتەدا پێویستە سیستەمی پەیوەندیی کردن، ستراکتۆر و پرۆسەکان و چونێتی ئاڵوگۆری زانیارییەکان رەچاوبکرێن. زاراوەی ((گەشەسەندنی کارگێڕی)) گۆڕانکاری و وەرچەرخانگەلێك لە دەروونی ستراکتۆری بڕیاردان و ئامرازی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکان لە خۆ دەگرێت.

لە بنەڕەتدا گەشەسەندن زاراوەیەکی بەهاییە و لەوانەیە هەر جۆرە وەرچەرخانێك کە بە پۆزەتیڤانە لە قەڵەم بدرێت، پێناسەبکرێت. لەم رەوتەدا مومکینە ئەو شتەی بە بۆچوونی کەسێك وەرچەرخان بێت، بە بۆچوونی ئەویتر دژە وەرچەرخان بێت.

بە پێی ئەم پێناسەیە دەوڵەتیش رێکخراوێکە بەو جیاوازییەوە. کە پانتای رێسا و یاساکانی بەرفراوانترە. ئەم رێسایانە گەرەنتی جێبەجێ بوونیان هەیە و بە پێچەوانەی رێکخراوە خۆبەخشەکان رێگەیەك بۆ دەربازبوونی ئەندامەکانی [لەم رێسایانە] نییە. بەڵام لە هەر دوو نموونەدا رووبەڕووی ستراکتۆرێکی کۆمەڵایەتی دەبینەوە کە بۆ ئەندامانی، رێساکان روایی دەکات. کارکردە سیاسی و کارگێڕییەکان ئاماژە بە خەسڵەتەکانی شیکردنەوەی بڕیاردانی رێکخراوەیی دەکات. ئەم بڕیارانە لە دوو قۆناغدا دەردەکرێن: قۆناغی یەکەم، دەست نیشانکردنی فۆرم و بەها و ئامانجەکان. قۆناغی دووەمیش پەیوەستە بە ئامرازی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی هەڵبژاردن لە نێوان دوو بەهای رکابەر کە لە هەڵبژاردنی یەك ئامانج هاوبەشن، دەکرێ بە ((سیاسی)) لە قەڵەم بدرێت و ئەو ئامرازانەش کە بۆ جێبەجێ کردنی ئامانج دیارکرابن ((کارگێڕی)) هەژمار بکرێن. بوونی ئەم مرۆڤە بەڵام ناتوانین ژیان



تەنیا لە جووڵە و بزاڤدا کورت بکەینەوە. هەر بەرزبوونەوەیەك لە موخریجاتدا (بەرزبوونەوەی داهاتی ساڵانە)، کاریگەری کارگێڕی، توانایی لە بڕیاردانی ((سیاسییانەتر))، باشتر لایەنە جۆراوجۆرەکانی بووژانەوە (رشد)، بۆمان روون دەکاتەوە. لەم رووەوە بووژانەوەی ئابووری، کارگێڕی و سیاسی هەڵقوڵاو لە گەشەسەندن، دەکرێ بەبێ ئەوەی هاوکات لەگەڵ گەشەسەندندا بن، ببینرێن بەواتایەکیتر پێویستە ئەم جۆرە گەشەسەندنە و هەندێ لە ئەنجامەکانی لێك جیا بکەینەوە.

زۆرێك لە توێژەران زاراوەی گەشەسەندن بەهاوتای ((بووژانەوە)) نازانن، لە زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا گەشەسەندن پێویستی بە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی، کولتووری و بووژانەوەی ئابوورییە. بەواتایەکیتر پێویستە گۆڕانکارییە چۆنێتییەکان هاوکاتی گۆڕانکارییە چەندییەتییەکان بن. بەم واتایە گەشەسەندن بە مانای گۆڕانکاری و بووژانەوەیە.

**فرە ستراکتۆری لە پرۆسەی گەشەسەندندا:**

فرە ستراکتۆری بە یەکێك لە پێودانکە گرنگەکانی گەشەسەندن هەژمار کراوە. زۆرێك لە چاودێران رەچاوی گرنگی پسپۆڕێتی بوونی (تخصص) رۆڵەکان و دابەشکردنی کاریان کردووە، ئەویش نەك تەنیا وەك رەگەزی پێویست بۆ بەرزبوونەوەی بە پیشەسازیی بوون و شێوازە هاوچەرخەکانی بەرهەمهێنان، بەڵکو هەروەها لە زانست، حکوومەت، هونەر و گشت دەرهاویشتە جۆراوجۆرەکانی شارستانییەتی هاوچەرخدا.

بەشێکیتر لە توێژەران گەشەسەندن لەو بەری فرە ستراکتۆری و پسپۆڕێتی بوون دەزانن. هەروەها بە بۆچوونی ئەم توێژەرانە نابێت گشت جۆرەکانی پسپۆڕێتی بوون و فرە ستراکتۆری، وەکو یەك بە گەشەسەندنەوە بەند بکەین. لە پرۆسەی پسپۆڕێتی بوون و فرە ستراکتۆریدا، رۆڵ و گرووپەکان لە چوارچێوەی گشتی بوونیاندا دێنەدەرەوە





و خاوەن کارکردێکی پسپۆرییانەتر دەبن. یەکێك لە خەسڵەتەکانی فرەیی، پسپۆڕێتی بوونی پیشەیە کە بەم پێیەش دەکرێ پیشە جۆراوجۆرەکان لێك جیابکرێنەوە.

یەکێك لە شێوازەکانی وەسفکردنی و ستراکتۆری رەچاوکردنی حەفت قۆناغەکەی ((هارول لاسویل))ە کە بریتیین لە، زانیاری، راسپاردن، تەجویز، بڕیار، جێبەجێ کردن، هەڵسانگاندن، کۆتایی هاتن

بەپێی ئەم شیکردنەوەیە فرە ستراکتۆری وەك پرۆسەیەك هەژمار دەکرێت کە تیایدا هەر قۆناغێك لە بڕیاردان بە [قۆناغێکی] جیاواز [لە قۆناغەکانیتر] دەزانرێت، کە تیایدا رۆڵگەلی جۆراوجۆر ئەنجام دەدرێن.

لێرەدا پرسی جیاکردنەوەی کارگێڕی لە سیاسەت لە ئارادایە، کارکردە سیاسییەکان بەپێی داڕشتنی یاساکان دیارکردنی رێباز و کارکردی کارگێری بە پێی جێبەجێ کردنی رێسا و یاساکان پێناسە دەکرێت لە رووی کردەییەوە مومکینە کاربەدەستە کارگێڕییەکان لە یاسادانان و جێبەجێ کردنیاندا بەشدار بن و ئەمەش لە کاتێکدایە کە سیستەمی کۆمەڵایەتی کە ئەم کاربەدەستانە وەك بۆرۆکرات تیایدا کار دەکەن، فرە ستراکتۆر نەبێت لەم چەشنە بارودۆخەدا یەکەی شیکردنەوە، سیستەمی کۆمەڵایەتییە نەك بۆرۆکراسی و سیستەمی سیاسی. ئەگەر بۆرۆکراسی بە یەکەی شیکردنەوە وێنا بکەین، خوێندنەوەکانمان پاژەیی (جزئی) دەبن و پەیوەندی ئەوتۆی بە فرە ستراکتۆرییەوە نابێت. ئەگەرچی پسپۆڕێتی بوونی پیشەی کار بەدەستە کارگێڕییەکان لە بوارگەلی وەك کۆکردنەوەی باج، ژمێریاری، چالاکییە یاساییەکان، گەشەسەندن و پەرەپێدانی کشتوکاڵ، پۆلیس و خزمەتگوزاری پۆستە، هێماگەلێکن لە جۆراوجۆر بوونی ئەرکەکان، بەڵام فرە ستراکتۆری لە بۆرۆکراسیدا بە پێی پسپۆڕێتی بوونی پلانی بە هۆی سەرهەڵدانی ئەرکگەلی نوێیەوە دەست نیشان نەکراوە و پانتاکەشی زۆر بەرفراوانترە.

ئەگەر سیستەمی کۆمەڵایەتی کە بۆرۆکراسی بە بەشێك لێی هەژمار دەکرێت، هەوڵی دارشتنی رێساکان بدات و کاربەدەستە کارگێڕییەکانیش ناچار بە جێبەجێ



کردنیان بکات، بەم جۆرە بۆرۆکراسی بەبێ رەچاوکردنی پسپۆڕێتی بوونی رۆڵی پیشە ناوخۆییەکانی، لە رووی ستراکتۆرییەوە دەبێت بە دەزگایەکی کارگێڕی فرە (متنوع) بوو.

بەپێی ئەو خاڵانەی کە باسکران لە کاتی خوێندنەوەی گەشەسەندنی سیاسیدا، تەنیا سیستەمی سیاسی رەچاو ناکرێت بەم جۆرەش ئەگەر یەکێك لە پێش مەرجە سەرەکییەکانی گەشەسەندنی سیاسی و نوێگەری، فرە ستراکتۆری بێت، لەو کاتەدا سەرهەڵدانی گرووپگەلێك کە بتوانن داواکارییەکان کۆبکەنەوە و بخەنەروو، گرنگی تایبەتیان دەبێت. ئەم گرووپانە بەرەگەزی جیانەکراو لە سیستەمی سیاسی هەژمار ناکرێن، بەڵکو بەشێکن لە سیستەمی کۆمەڵایەتی. لە رووی ستراکتۆرییەوە سیستەمی سیاسی تا ئەو ئاستە دامەزراوەکان بەفرەیی (متنوع) دەکات، کە گشت دامەزراوەکانیتر کە خاوەن کارکردی وەك کۆکردنەوەی زانیاری، دۆزینەوەی ئەلترناتیڤ (کۆکردنەوە و خستنە رووی داواکارییەکان) و کارکردی کارگێڕییان هەیە، سەرهەڵبدەن و لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا وەك ستراکتۆری جیاواز لە ستراکتۆری سەرەکی ئەرکەکانیان ئەنجامبدەن. بەم پێیەش گەشەسەندن واتە سەرهەڵدانی سیستەمگەلی سیاسی و کارگێری کە لە رووی ستراکتۆرییەوە بووبن بە فرە ستراکتۆر.

هاوتەریب لەگەڵ فرەیی بوونی ستراکتۆرەکاندا سیستەمە لاوەکییەکانی (sub-system) کارگێڕی و سیاسی سەرهەڵدەدەن. ئەوان بەشێك لە بڕیارەکان دەردەکەن. بەڵام ناکرێ وەها چاوەڕوان بکرێ کە فرە ستراکتۆری لێك جیا بوونەوەی سیستەمە لاوەکییە کارگێڕی و سیاسییەکانی بکەوێتەوە.

لە رووی مێژووییەوە یەکێك لە باوترین جۆرەکانی سەقامگیر بوون. سەرهەڵدانی بۆرۆکراسی یاخود پلە بەندی (سلسلە مراتب) کاربەدەستانە. لە پراکتیکدا بۆرۆکراسییەکان بۆ ئەو دەوڵەتەی کە کاری بۆ دەکەن، کارکردی کارگێڕی و سیاسییانەیان هەیە. ئەوان بەهاکان دابەشدەکەن و ئامرازگەلی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکان فەراهەم دەکەن، بە چەشنێك کە سەرهەڵدانی ستراکتۆرە سیاسییەکان لە دەرەوەی بۆرۆکراسیدا، بۆرژانەوەی ئابووری کارامەیی کارگێڕی و گەشەسەندن پێویست نییە.





بە گشتی ئەو کەسانەی کە کارکردی سیاسییان هەیە، کەسانێکن کە دەسەڵاتی زۆرتریان هەیە و گرووپی نوخبەپێکدێنن. هەندێ جار نوخبەکان دەسەڵات بۆ دابین کردنی بەرژەوەندییەکانیان بەکار دێنن. ئەم کارەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگا نەتوانێت بە شێوەیەکی کارا سوود لە توانایی و سەرچاوەکانی وەرگرێت.

ئەگەر نوخبەکان لە دەرەوەی دەسەڵاتدا بن، مومکینە گوشار بخەنە سەر بۆرۆکراسی و بۆرۆکراتەکان ناچار بکەن بە پێڕێسا و ئەرکەکانیان کاربکەن ئەم کارەش ئاستی کارامەیی و کاریگەر بوونی بۆرۆکراسی بەرزدەکاتەوە زۆر جار لەوانەیە وەها بەڵگاندن بکرێت کە سیستەمی کارگێڕی ناتوانێت ببێتە هۆی وەرچەرخانێکی گەورە لە نوێگەری سیاسیدا، تەنیا ئەو کاتە نەبێت خودی خۆی سەرەڕای جێبەجێ کردنی بڕیارەکان، لە سیاسەت دارِشتنیشدا ڕۆڵی سەرەکی هەبێت. هەندێ جار وەها وێنا دەکرێت کە ئەگەر بێتو بۆرۆکراسی خۆی لە دیارکردنی ڕێبازەکان دوور بخاتەوە، دەتوانێت وەك جێبەجێکەری کاریگەر کاربکات. بەڵام تەنانەت ئەگەر بێتو دامەزراوگەلێك هەبن کە پێشوازی لە ئەنجامدانی کارکردگەلی سیاسی بکەن، ناکرێ دڵنیا بین کە بۆرۆکراسییەکی دەسەڵاتدار خوازیاری گواستنەوەی ئەم کارکردانە بۆ دامەزراوەگەلی تر بێت.

کۆنترۆڵکردنی دیموکراسی لە لایەن دامەزراوە سیاسییەکانەوە لە دەرەوەی بۆرۆکراسیدا، پشت بەستراوە بە هێزی گرووپەکانی سەرووی بۆرۆکراتیك و لاوازی سیاسی بۆرۆکراتەکان، نەك مەبەستە ئاشکراکانی کاربەدەستانی حکوومەت و ئەرك و کارکردە دەست نیشانکراوەکانی ناو پەیڕەو و پڕۆگرامی ڕێکخراوەکەدا، زۆر جار بۆرۆکراتەکان ناتوانن ڕۆڵەکانیان لە ڕۆڵێکی ئامرازیدا کورت بکەنەوە دەستێوەردانی لەڕادەبەدەری بۆرۆکراسی لە پاساودانان و سیاسەتدا مومکینە دیموکراسی تووشی مەترسی بکاتەوە. بە هەر حاڵ تێکەڵ بە یەکتر کردنی سیاسەت و کارگێڕی پێویستە نەبێت بە لەمپەرێك لە بەردەم گۆڕانکارییە سەرەکییەکان لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا.



بە پێی مودیلی ئایدیالی ((ئێبر))، پێویستە ڕۆڵی بۆرۆکراسی لە سیاسەت جیاواز بێت بە گشتی ئەو کەسانەی کە لە ئاستە بەرزەکانی بۆرۆکراسیدا جێگرن هەمیشە گیرۆدەی پرۆسەی سیاسین. زۆر سەختە کە تەنانەت لە فرەیی بووەترین ستراکتۆرەکانیشدا وەها چاوەڕوان بکرێت کە بۆرۆکراسی لە ئەنجامدانی ڕۆڵێکی ئامرازیدا کورت بکرێتەوە. هەندێ جار پرسە سیاسییەکان، لە ڕەفتاری کارگێڕیدا ڕەنگ دەدەنەوە. لەم چەشنە بارودۆخەدا بۆرۆکراسی بە سەر بڕیارە سیاسییەکاندا کاریگەری دەنوێنێت. ئەم بابەتە سەبارەت بە وڵاتانی لە دۆخی گەشەسەندندا. کە تیایدا کەرتی حکوومی گرنگترین ڕۆڵی لە گەشەسەندنی نیشتیمانیدا دەگێڕێت، زەقترە.

لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەمدا ناکۆکی نێوان سەرکردە سیاسییەکان و بۆرۆکراتەکان بە ئاستێك دەگات، کە چیتر ناکرێ بۆرۆکراتەکان بە ئامرازگەلی هەڵچوو (منفعل)ی بەردەست نوخبە سیاسییەکان هەژمار بکرێت. چونکە ئاستە بەرزەکانی بۆرۆکراسی بە توندی گیرۆدەی سیاسەتی گەشەسەندن و نوێگەرین، بۆیە ئەم کەرتە شوێنێکی تایبەتی لە ستراکتۆری دەسەڵاتدا هەیە.

### ئەنجامەکان:

پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسی و نوێگەری زۆر و لە بەدیهێنانیدا فاکتەر و بگۆڕی جۆراوجۆر بەشدارن. ئامانجی سەرەکی لە چوونە ناوەوەی ئەم پرۆسەیەدا بەرزکردنەوەی توانایی سیستەم بۆ وەڵامدانەوەی باشتر لە هەمبەر داواکارییەکانی کۆمەڵگایە. لەم ڕەوتەدا گریمانەی سەرەکی لە سەر ئەم پرەنسیپە وەستاوە کە کۆمەڵگا بزاڤ و دینامیزمی پێویستی هەیە بۆیە پێویستە سیستەم بتوانێت بە بەکارهێنانی تواناییەکانی بەردەست، بڕیارگەلێك دەربکات و جێبەجێیان بکات کە لەگەڵ بارودۆخی گۆڕاوی کۆمەڵگادا بگونجێت. لەم ڕەوتەدا سیستەمی کارگێڕی پشکی سەرەکی لە بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەی لە ئەستۆیە. چونکە سەرەڕای بوونی توانایی و سەرچاوەکانی پێویست لە چینگەی سیستەمدا، ئەگەر دەزگای کارگێڕی کارامە





نەبێت. ئەم ئامانجە بەدینابێت. هەر بۆیەش پێش چوونە ناوەوەی قۆناغی نوێگەری سیساسیدا، پێویستە چاکسازی بنەڕەتی لە ستراکتۆر و کارکردی سیستەمی کارگێڕیدا روویدابێت تا بتوانرێت وەڵامی داواکارییەکان بدرێتەوە چونکە لە نێوان ستراکتۆرە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا پەیوەندی لە ئارادایە. بۆیە پێویستە جۆری مامەڵەی دوو لایەنەی نێوان ستراکتۆرە سیاسی و کارگێڕییەکان خوێندنەوەی بۆ بکرێت. ئەگەرچی لە رووی تیۆرییەوە کارکردی کارگێڕی و سیاسی بە پێی جێبەجێ کردنی بڕیارەکان و دەست نیشانکردنی رێبازەکان پێناسە دەکەین و هەوڵدەدەین لێکیان جیابکەینەوە، بەڵام لە پراکتیکدا. بە تایبەتیش لە کۆمەڵگاکانی لە دۆخی گۆزاردا، رووبەڕووی بە سیاسی بوونی کارگێڕی یاخود بۆرۆکراتیزە بوونی سیاسەت دەبینەوە. ئەگەرچی هەندێ جار ناتوانین لە رووداني ئەم تێکەڵییە بەربەست بنوێنین بەڵام لە مامەڵەکردنیاندا پێوستە بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکەین کە بارگرژییەکان بە کەمترین ئاست بگەێنین.

سوود وەرگرتن لە تواناییەکانی سیستەم بە تایبەتیش پالاوتن (استخراج)، رێکخستن و دابەشکردن، دەتوانن بە زەمینەی لە بار بۆ بەدیهێنانی نوێگەری سیاسی و کارگێڕی هەژمار بکرێن بەم جۆرەش سەرەڕای ئەوەی کە پێداویستی نوێگەری و گەشەسەندنی سیاسی، وەرچەرخانی سیستەمی کارگێرییە، بەڵام خودی گەشەسەندنی کارگێریش پێویستی بە وەرچەرخان لە ستراکتۆرەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، پەیوەندی و... هەیە. بە رەچاوکردنی ئەم پێودانگانە تەنیا لە رێگەی خوێندنەوەیەکی هەمەلایەنە دەتوانین پەیوەندی نێوان وەرچەرخانی کارگێڕی و سیاسی دیاربخەین.



# بەشی شەشەم

## کولتووری سیاسی نموونەیەك بۆ شیکردنەوەی پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسی

کولتووری سیاسی بریتییە لە بەرداشی خەڵك و ئاراستەگیریان لە هەمبەر سیستەمی سیاسی و کارکردەکانی، کە لەم بوارەدا بنەما و وێناکان لە هەمبەر دەسەڵات، بەرپرسیارێتی حکوومەت و نموونەکانی پەیوەست بە کۆمەڵگابوونی سیاسی رەچاو دەکرێن لە پرۆسەی بە کۆمەڵگا بوونی سیاسیدا، تاکەکان سەرەڕای ئاشنایەتی بە سیستەم، لە رێگەی بەدەستهێنانی زانیاری و ئەزموون، پەی بە ئەرك و ماف و رۆڵەکەیان لە کۆمەڵگادا دەبەن. بەم جۆرەش کولتووری سیاسی بەرهەمی مێژووی سیستەمی سیاسییە کە ریشەی لە رەفتاری گشتی و ئەزموونە کەسییەکاندا هەیە و خوێندنەوەی وردیشی، پرۆسەی گۆڕینی داواکارییەکان بۆ بڕیار، ستراتیژی و سیاسەتەکان نیشاندەدات. بەم پێیە، شیکردنەوەی رەهەندە جۆراجۆرەکانی کولتووری سیاسی دەتوانێت وێنەیەکی راستەقینە لە پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی سیاسی و بەهاکان بەدەستەوە بدات، و یارمەتیمان دەدات رادەی مەشروعییەتی سیستەمی سیاسی هەڵبسەنگێنین. چونکە ژینگەی سیستەم [ژینگەیەکی] بەهاییە، کەواتە کولتووری سیاسی ئاراستەگیری خەڵك لە هەمبەر دامەزراوە، ستراکتۆر و کارکردە سیاسییەکان دیار دەکات. چونێتی بەشداریی سیاسی، شێوازی دەنگدان، پشتگیری و پشتگوێ خستنی سیستەم، پەیوەندی بە بەها، بۆچوون، هێما جێگیر بووەکان هەیە. تیۆری کولتووری سیاسی هاوچەرخ، بە پێچەوانەی دەیەکانی رابردوو، جەختێکی ئەوتۆ لە سەر وێنا ناخودئاگاکان ناکاتەوە و کەمتر رۆڵ گێڕانی قۆناغی منداڵی و ستراکتۆری خێزان وەکو پرۆسەی سەرەتای بە کۆمەڵگا بوونی سیاسی رەچاو دەکات. تیۆری ناوبراو ئاستی ناسینی ستراکتۆر و کارکردەکانی سیستەمی سیاسی و کارامەیی ئابووری رەچاو دەکات.

### پرۆسەی بە سیاسی بوونی کولتوور:

یەکێك لە پرسە ئاڵۆزەکان لە خوێندنەوەی کولتووردا، لێك جیاکردنەوەی رەگەزە سیاسی و ناسیاسییەکانە. لێك جیاکردنەوەی ئەم رەگەزانە تارادەیەکی زۆر پەیوەستە

به پێناسەکردنمان لە سیاسەت. بەم پێیە نابێ وەها بیربکرێتەوە کە گشت رەگەز و بەشە پێکهێنەرەکانی کولتوور توانایی و لێهاتوویی سیاسی وەك یەکیان هەیە. شیکردنەوەی وردی هەر کولتوورێك، نیشانماندەدات کە چ بەشگەلێك لە هەر کولتوور، مەیلی بۆ بە سیاسی بوونی هەیە و چ بەشگەلێك ناوڕۆکی ناسیاسییانەیان هەیە بەبێ ناسینی وردی خەسڵەتی هەر بەشی کولتوورێك، ناتوانرێت وێنەیەکی دروست لە توانایییە مەوجودە سیاسییەکانی ئەم کولتوورە پێشکەشبکرێت. لە ئەنجامدا، ناتوانین بۆ بەرفراوان کردنی بەشداری و گەشەسەندنی سیاسی سوود لە تواناییەکانی وەربگرین. بە پێچەوانەوە، ئەگەر بە ناهۆشیارییەوە هەوڵ بۆ بە سیاسی کردنی کەرتگەلێك لە کولتوور بدەین (کە لە ناوڕۆکدا ئەم خەسڵەتەی نییە)، لەوانەیە ئەم کارە سیستەمی سیاسی رووبەڕووی قەیرانی سەقامگیر بوونی دەسەڵات و مەشروعییەتی سیاسی بکاتەوە و داواکارییە درۆییەکان زیادبکات کە ئەم بارودۆخەش، لە قۆناغی دواتردا، مومکینە ناتوانایی سیستەم لە گۆڕینی داواکارییەکان بۆ سیاسەت بسەلمێنێت.

زۆرێك لە رەگەزە پێکهێنەرەکانی کولتوور بەپێی پێودانگە سروشتی و ئەستورەییەکانەوە هەڵدەسەنگێنرێت، کە زۆرتر لە دۆخی ((ناسیاسی))دان. بەڵام دوای دەربازکردنی قۆناغی بنیاتنانی دەوڵەت — نەتەوە و دوای بەرقەرار کردنی پەیوەندی لە نێوان سیستەم و ژینگەکەی، زۆرێك لە نۆرم، بڕوا و بەهاکان لە دۆخی ناسیاسییەوە دەردێن و ((بە سیاسی بوون)) دەبن لەم قۆناغەدایە کە رادەی ناسینی دەسەڵات، بەرپرسیارێتی، کارکرد، ئامانج، دامەزراوە و ستراکتۆرە سیاسییەکان لە لایەن تاکەکانەوە گرنگی تایبەتیان دەبێت.

چونکە دابەشکردنی کولتووری سیاسی لە ئاستە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا و لە نێوان گرووپە چینایەتی، پیشەیی، خوێندەواری، کۆمەڵایەتی و ئابووری یەکسان نییە، بەم پێیەش رووبەڕووی بەرداش، دزککردن، لایەنگری و ناکۆکی سەبارەت بە



مەشروعییەت و کارکردی سیستەمی سیاسی دەبینەوە کە ئەمەش پانتایەکی بەرفراوانی رەفتاری سیاسی دەخولێقێنێت.

دابەشکردنی نایەکسانانەی دەسەڵات کە جیاوازی لە نێوان نوخبە و جەماوەردا دروستدەکات، رەنگدەرەوەی کولتوورگەلی سیاسی جۆراوجۆر و لێك جیاوازە بە چەشنێك کە ناتوانرێ تێگەیشتنی یەکسان و وێکچوو لە نێوان جەماوەر و نوخبەدا بۆ دەسەڵاتی سیاسی، بەرپرسیارێتی، مەشروعییەت و... ببینرێت لەو رووەوە کە بە بەراورد لەگەڵ جەماوەردا، نوخبە سیاسییەکان، بەهاو نۆرمگەلی لێك جیاوازیان هەیە، زانیاری زۆرتریان سەبارەت بە سیستەمی سیاسییان هەیە، دەتوانن لە رووبەرێکی بەرفراواندا سەرکردایەتی گۆڕینی بەهاکانی کۆمەڵگا بکەن. لەم ئاراستەیە مومکینە گرووپە نەژادییەکان تێگەیشتنی جیاوازیان لە رەفتاری سیاسی فەرمانڕەوا هەبێت. هەروەهاش مومکینە هەندێ دامەزراوەی وەك سوپا و زانکۆ ئاراستەگیری جیاوازیان بۆ دەسەڵاتی سیاسی هەبێت.

**وەرچەرخان لە شێوازی خوێندنەوەی کولتووری سیاسیدا:**

خوێندنەوەی کولتووری سیاسی قۆناغی جۆراوجۆری تێپەراندووە و لە هەر قۆناغێکیشدا جەخت لە بگۆڕێکی (متغیر) تایبەت کراوە و لە گۆشەیەکی تایبەتەوە رامانی بۆ کراوە. لە دەیەی ١٩٦٠دا، بە گشتی جەخت لە سەر بگۆڕەکانی نموونەی پارسوتر، کارکردگەرایی ئەلموند و هەندێ بۆچوونەکانی مارکسیستی دەکرایەوە. لە روانگەی مارکسیستەکانەوە، کولتووری سیاسی بگۆڕێکی وابەستە (تابع)یە، لە کاتیکدا کە کەسانیتر، بە بگۆڕێکی سەر بە خۆ هەژماری دەکەن. تیۆرنریەنە سیستەمی و کاردکردگەراکان، کولتوور بە بەشێك لە ژینگەی سیاسی کۆمەڵگا دەزانن. لەو قۆناغەوە یەکدەنگییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە پێناسە و تیۆرەکان بۆ خوێندنەوەی نموونەکان بەرچاو ناکەوێت. لە بەشی پێناسەکردندا، رێبازی دەروونناسەکی کولتووری سیاسی زۆرتر جەخت لە سەر ئاراستەگیری تاك لە هەمبەر





ئامانجە سیاسییەکانەوە دەکات و لە بەشێکی تردا ئەم بابەتە بەپێی فۆرم و بەهاکانی بەرقەرار پێناسە کراوە. هەندێ جار کولتووری سیاسی لە چوارچێوەی کولتووری نەتەوەیی، شوناسی سیاسی و ئایدیۆلۆژیای بەرقەراردا وەسفکراوە یاخود بە بەشێك لە سیستەمی رەوشتی کۆمەڵگا هەژمار کراوە. فرە لایەنی رەهەندەکانی کولتووری سیاسی گرفتگەلی زۆری بۆ پێناسەکردنی خولقاندووە پێش بڵاوبوونەوەی پەرتووکی شۆڕشی لە سەر خۆی ((ئینگلهارت)) نموونە باوەکانی شیکردنەوەی کولتووری سیاسی بریتی بوون لە : کارکردگەرایی،

### تیۆری سیستەمەکان و روانگەی مارکسیستی:

لە چوارچێوەی کارکردگەراییدا، پرسی سازگاریی و دژ یەك بوونی بەهاکان بە تەوەری سەرەکی شیکردنەوەی رەفتاری سیاسی هەژمار دەکرێت. بە بۆچوونی ((دۆرکهایم)) و ((پارسۆنز)) بەها و فۆرمەکان بەشە سەرەکییەکانی واقیعییاتی کۆمەڵایەتین و دەتوانن بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا پێکەوە گرێبدەن. بەم پێیەش ناتوانایی کۆمەڵگا لە بەدیهێنانی کولتوورێکی پشت بەستراو بە کۆدەنگی یاخود پۆلۆرالیومی دەبێتە هۆی گۆڕانکاریگەلی رەفتاری و ستراکتۆری کە ئەمەش پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان رووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە. بە بۆچوونی ((ئەڵموند))و ((ڤێبربای)). نموونە (نموذج) دەتوانێت ببێتە هۆی دۆزینەوەی زنجیرە فۆرم و بەهاگەلێك کە ئەمەش یارمەتی دامەزراندنی حکوومەتێکی کاریگەر و سەقامگیر دەدات بە پوختی، ئەنجامی ئەم جۆرە باسانە بەرەو رێکخستنی گۆڕانکارییە لەسەرخۆیەکان و پاراستنی سەقامگیری ئاراستەمان دەکات تا ئەمەش لە ئەرکەکانی حکوومەت و زانستە سیاسییەکان بزانین. رێبازی دووەم، تیۆری سیستەمە، ئەم تیۆرییە لە سەر ئەم گریمانەیە وەستاوە کە هەر سیستەمێك بۆ بەردەوام بوونی دەبێ موخریجاتی (out pat) پێویست بەرهەم بهێنێت لێرەدا، دوو پرس گەڵاڵە دەبێت:



١. گریمانە مشتومڕوییەکانی کۆمەڵ ناسییانە و بێولۆژیکی جێی گریمانە سیاسییەکان دەگرنەوە.

٢. شێوازی بەرهەمهێنانی کولتووری سیاسی لە ژینگەی سیاسیدا، کە ئەمەش ئەم پرسیارە گەڵاڵە دەکات کە چۆن بەهاکان دەخنە ژێر کاریگەریدا و چۆن مودخیلانە رەفتارییەکان بۆ ژینگەی سیستەم دەگەڕێنەوە (feed back)؟

ئەندامانی هەر کۆمەڵگایەك لە چوارچێوەی کولتوورێکی تایبەتدا هەڵسوکەوت دەکەن. هەر کولتوورێك خەسڵەتی تایبەت بە خۆی هەیە کە جەخت لە سەر هەندێ هێماگەلی رەفتاری دەکات. هەندێ لە کولتوورەکان جەخت لە سەر داواکارییە ئابوورییەکان و کارامەیی لۆژیکانە دەکەنەوە، لە کاتێکدا کە هەندێکیتر جەخت لە سەر دەسەڵات و ئیعتبار دەکەنەوە بەم چەشنەش تێگەیشتن لە داواکاری کومەڵگا پێویستی بە تێگەیشتنێکی راست و دروستی خەسڵەتە کولتوورییەکان هەیە.

بە پێی شیکردنەوەی سیستەم لە کولتووری سیاسی بەم ئەنجامە دەگەین کە سیستەمی سیاسی خاوەن کولتوورێکە لە ئاستەکانی سیستەم، پرۆسە و سیاسەتدا. کولتووری سیستەم پێکهاتووە لە ناسین، هەست، دادوەری کردنی بەرپرسە سیاسییەکان و رۆڵەکان، نەك حکوومەت. بەم پێیەش کاتێك کە باس لە مەشروعییەتی سیستەمی سیاسی دەکەین، پێویستە دیاربخەین کە ئێمە سەرکردە، پلە و پایە، پۆست، حکوومەت، نەتەوە یاخود تێکەڵێك لەم بابەتانە رەچاو دەکەین یاخودنا؟ کولتوورێك لە ئاستێکی بەرفراواندا گەڵاڵە دەکرێت، ناسین، هەست، دادوەر لە هەمبەر ئەندامانی سیستەمی سیاسی لە هەمبەر خۆیان وەك ئەکتەرێکی سیاسی و بەراوردکردنیان لەگەڵ سیستەمە لاوەکییەکانی (subsystem)تر وەك پارتە سیاسییەکان، گرووپی بەرژەوەندی و نوخبە حکوومی و سیاسییەکان لە خۆدەگرێت. دواجار، لە ئاستی سیاسیدا، کولتوور ناسین، هەست و دادوەری سیستەمی سیاسی لە هەمبەر موخریجاتەکانی خۆی لە چوارچێوەی سیاسەتی ناوخۆ (لە رووی رادەی توانایی لە پاڵاوتن (استخراج)، رێکخستن و دابەشکردن) و سیاسەتی دەرەوە





(سەربازی، دیپلوماتیك و ئابووری) لە خۆدەگرێت. ئەم سێ ئاستە پەیوەندی پتەو و بەردەوامیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە، بە چەشنێك کە نارەزامەندی خەڵك لە هەمبەر موخریجاتەکانی سیاسەت لەوانەیە بۆ ناو کاربەدەستانی حکوومەتیش دزە بکات. هەروەها مومکینە نارەزامەندی خەڵك لە پرۆسەی سیاسی بەگژدا چوونەوەی حکوومەتی لێبکەوێتەوە و ببێتە هۆی گۆڕینی ستراکتۆری حکوومەت. هەروەها نارەزامەندی لە سەر موخریجاتی سیاسەت لەوانەیە گۆڕینی کاربەدەستە سیاسییەکانی لێبکەوێتەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە ناسازگایی لە ئاستەکانی پرۆسە و سیاسەتدا، بە تایبەتیش لەو وڵاتانەی کە گرووپی نەتەوەی جیاواز لە خۆوە دەگرێت. بەرەبەرە دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی مەشروعییەتی نەتەوەیی و زیادبوونی مەیلی خۆدوورخستنەوە لە ناوەند، سێیەمین ڕێباز بۆ شیکردنەوەی کولتووری سیاسی، مارکسیزمە کە لە میانەیدا رۆڵی کولتووری سیاسی بۆ رۆڵی دووەم [واتە رۆڵی سەرەکی ناگیرێت] دادەبەزێت. لەم روانگەیەوە، کولتووری سیاسی بە بەشێك لە سەر خانی کۆمەڵگا هەژمار دەکرێت کە رەنگدەرەوەی پەیوەندییە ئابوورییەکانە. بەم چەشنە، نۆرمە کولتوورییەکان بەپێی بنەما ئابووری و کومەڵایەتییەکان دیار دەکرێن. چونکە لە رووی چینایەتییەوە پێگەی ئابووری و کومەڵایەتی دابەشکراوە، بۆیە ناکۆکی و مشتومڕ زۆرتر لە نێوان کولتووری زاڵی چینی فەرمانڕەوا و جۆرەکانیتر وردە کولتووری چینەکان روو دەدات.

لە کاتێکدا بە پێی ڕێبازی رەفتاری، زۆربەی دیموکراسییەکان خاوەن کولتووری نەتەوەیین کە بەرهەمی وەرچەرخانی مێژوویی ئەم نەتەوانە بووە و لە رێگەی دامەزراوە کومەڵایەتییەکانی وەك خێزان لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکیتر دەگوازرێتەوە. ڕێبازی مارکسیستی ئەم جۆرە لێکدانەوەیە رەت دەکاتە، جەخت دەکاتەوە کە کولتووری سیاسی بەرهەمی هەوڵدانی چینە فەرمانڕەواکانە بۆ سەپاندنی بەهاکانیان بە سەر چینەکانی خواروتر بەپێی کاروبارەکانی فەرمی حکوومەت بۆ نموونە سیستەمی پەروەردە لە روانگەی رەفتارییەوە گواستنەوەی



بەهاکان لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکیتر بە بەکۆمەڵگا بوون ناودەبردرێت، بەڵام بەپێی شیکردنەوەی مارکسیستەکان، گواستنەوەی بەهاکان بۆ چینەکان لایەنی تەلقینی هەیە.

بەپێی ئەم ڕێبازە، کولتووری سیاسی نەتەوەیی لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا زۆر لەرزۆکە و لەم رووەوە، هەندێ جار کردەوەگەلێك بۆ پشتگیری کردن لە رووخانی سیستەم ئەنجامدەدرێن. بەپێی ئەم شیکردنەوەیە کولتووری سیاسی بەرهەمی پووچەڵی مێژوویی کۆمەڵگا هەژمار ناکرێت، بەڵکو بە رەفتارێکی کەم تا زۆر هۆشیارانەی چینی دەسەڵاتدار بۆ مەشروعییەت بەخشین بە دەسەلاتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکەی هەژمار دەکرێت. بەم چەشنە، کولتوورە لیبرالە دیموکراسییەکان جەخت لە سەر بەهاگەلێك دەکەنەوە کە دەبێتە هۆی دابەشبوونی چینە ژێر دەستەکان یاخود بواری یەکگرتوویی چینەکانی لە ئاستە بەرزەکاندا فەراهەم دەکات.

پێویستە ئاماژە بکرێت کە پێکهاتەی ڕێبازی مارکسیستی لە کولتووری سیاسی هەندێ لاوازی پێوە دیارە، رەخنەگەلیش ئاراستە دەکرێت، چونکە ناکرێ وەها وێنا بکرێت کە چینە ژێر دەستەکان هەمیشە رادیکالین، تەنانەت زۆرێك بەڵگە دەربڕی ئەوەن کە ئەم چینە زۆر جار بۆچوونی پارێزەرانەی هەیە. ئەم ڕێبازە خەسڵەتە ئالۆزەکانی هەر کولتوورێك زۆر بە ساکار دەزانێت و رۆڵی کولتوور لە پاراستنی دیسپلینی یەکپارچەی کۆمەڵگا بێ نرخ لە قەڵەم دەدات.

سەرەڕای ئەم ڕێبازانە، کولتووری سیاسی لە چوارچێوەی ((هەژمونی))دا خوێندنەوەی بۆ کراوە. بەم پێیە بەهاگەلی جۆراوجۆر لە دروستکردن و پاراستنی کولتووردا بەشدارن. بەپێی ئەم شیکردنەوەیە، گشت وێنا و بەهاکان بەرهەمی رەزامەندی گشتین. بەم جۆرەش، هەر پەرت، گرووپ و حکوومەتێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پێویستە بتوانێت بەهاکانی بۆ لایەنی بەرامبەر (مخاطب) بقەبوولێنێت تا لە سایەی ئەم قەبوولکردنەدا مەشروعییەتی پێویست بەدەستبهێنێت. بەم چەشنە بەپێی ئەم روانگەیە، کولتوورێك نە سروشتییە و نە لایەن چینە کومەڵایەتی و ئابوورییەکانەوە دیاردەکرێت، بەڵکو بەرپەرچدانەوە و وەڵامدانەوەییێکە بۆ پەیوەندییە

بەرقەرارەکانی نێوان هێزەکان و ناکۆکییەکانی دەسەڵاتی سیاسی، بەپێی ئەم شیکردنەوەیە. خوێندنەوەی کولتووری سیاسی لایەنی مێژوویی هەیە و شیکردنەوەیەکی.

**ڕەخنەگرانایە لە هێزە سیاسی و ئابوورییەکان:**

لە پراکتیکدا، هەندێ لە توێژەران جەخت لە سەر پێداویستی گرووپگەلێك دەکەنەوە کە بەردەوام هەوڵی نوێگەری کولتووری سیاسی خۆیان و نامەشروع کردنی کولتووری سیاسی بەرهەڵستکاران دەدەن. بە بۆچوونی تیۆری هەژموونێکی چینی دەسەڵاتدار نەك تەنیا لە رووی ئابووری و سیاسییەوە کونترۆڵی کۆمەڵگا دەکات، بەڵکو کولتوور و نورمگەلەکانی وەها گشتگیر دەکات کە گرووپەکانی ژێر دەسەڵات وەها برِوا دەکەن کە ئەم جۆرە روانگەیە، بەشێکە لە دیسپلینی سروشتیانەی جیهان.

هەروەك ئاماژەمان بۆ کرد پێش حەفتاکان نموونەی خوێندنەوەی کولتووری سیاسی لە سەر بنەمای توێژینەوەکانی ئەڵموند، ڤێربای و لیپست بوو. بەم پێیەش، کولتووری سیاسی بە دابەشکردنی هەستی زانیاری، بنەماکان، شارەزایی سیاسی یاخود لە چوارچێوەی ئاراستەگیری سیاسی لە هەمبەر سیستەمدا پێناسەدەکرا کە تیایدا سێ رەهەندی ناسین، هەست و بەهاگەری رەچاودەکرا. دوای خوێندنەوەی کولتووری سیاسی لە ولاتانی مەکزیك، ئیتالیا، ئەڵمانیا، ئەمریکا و بریتانیا، سێ جۆر کولتووری تەقلیدی (سنووردار)، بەشداری (چالاك)، پەیرەو (هەڵچوو) دیار خران. بەڵام چونکە کولتووری سیاسی شێوازگەلی تێکەڵاویشی هەیە بۆیە تەنیا کولتووری مەدەنی دەتوانێت گەرەنتی دیموکراسییەکی کاریگەر و بەردەوام بکات. بەم جۆرەش، تێکەڵێك لە کولتوورەکانی پەیرەو بەشداریکردن دەتوانێت ببێتە هۆی بەهێزکردنی متمانەی دوو لایەنەی نێوان نوخبە و جەماوەر و خەڵك بە پۆزەتیڤانە سەیری دەسەڵات بکەن. توێژەرانی ناوبراو لە سەرەوە، بە خستنەڕوو تیۆری ((کولتووری مەدەنی)) بە شاراوەیی گریمانەکەیان لە سەر بالاَیی رەوشی دیموکراسی



دامەزراند، تا ئەو رادەیەی کە لە چوارچێوەی تیۆری هاوگەراییدا ئەم وێنایە بەهێزتر دەبێت کە گشت رێرەوە کولتوورییەکان بەرەو کولتووری مەدەنی کۆتا دێت. لەم جۆرە کولتورەدا، کولتوری سیاسی بەشداریکردن. لە میانەی ئاراستەگیرییەکانی [کولتووری ] پەیرەو سنووردار بۆ پرسە سیاسییەکان هاوسەنگی [کوولتورەکانیتر] دەبێتەوە. بەم جۆرەش، تاکەکان بۆ دیارکردنی پێشڤەچوونەکانیان لە کاروباری سیاسیدا چالاکی دەنوێنن، بەڵام لە گشت بابەتەکاندا ئەم بەشداریکردنە ناتوانێت لە سەر رەفتاری نوخبە سیاسییەکاندا کاریگەر بێت. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کوولتورە بریتییە لەوەی کە هاووڵاتی هەستدەکات توانایی پێویستی بۆ کاریگەر بوون بە سەر حکوومەتدا هەیەتی، بەڵام بە باشتر دەزانێت کە ئەم کارە نەکات کە ئەم کارەش جۆرە بکیشتمانێك (انعطاف) بۆ حکوومەت دروستدەکات.

**دووبارە روانین بۆ کولتووری سیاسی:**

هەوڵدانی جیددی بۆ دووبارە دامەزراندنی نموونەیەك بۆ کولتووری سیاسی لەلایەن ((رونالد وینگهارت))ەوە ئەنجامدرا. دەمارگرژی نەتەوەگەرایانەی هەندێ توێژەری وەك ئەڵموند، ڤێربای و... بۆ شیکردنەوەی کولتوری سیاسی گشتاندنی ئەنجامەکانی بە سەر کۆمەڵگا نارۆژئاواییەکاندا بووە هۆی ئەوە کە لە حەفتاکانەوە، رەخنەگران لە گۆشەنیگای تایبەتەوە بابەتی کولتووری سیاسی، سەر لە نوێ خوێندنەوەی بۆ بکەن. بە درێژایی ئەم ماوەیە، توێژەرانی وەك ((پارکین)) ناکۆکی لە نێوان کولتوورە رادیکالییەکان، پەیرەو و زاڵ خوێندنەوەیان بۆ کرد. کاتێك کە کەسانی وەك ((هال)) هۆکانی خوێندنەوەی لەرێ لادانی کولتووری و چونێتی بالادەست بوونی بە سەر کولتوورەکانیتردا دەکردە ئینگهارت گریمانەکەی خۆی لە چوارچێوەی ماتریالیزمەوە خستە بەردەم مەحکی تاقیکردنەوەدا. توێژینەوەکانی ئەو سەربارەت بە هەندێ وڵاتی ئەورووپی دەربری گۆڕانی بنەما (مقدمات)ی گەنجان، بە هۆی گۆڕانی بەهاکان بوو کە ئەم بارودۆخەش دەیتوانی لە رادەی پشتگیری کردنیان بۆ پارتە سیاسییەکان رۆڵی





سەرەکی هەبێت. دەکرێ ئاسەواری ئەم گۆڕانکارییە لە کۆمەڵایەتی هەڵسوکەوتی سیاسی، کەم بوونەوەی ڕێژەی هەڵسوکەوتی چینایەتی، وەرچەرخان لە پشتگیری کردن لە دامەزراوە نەتەوەییەکانی بەرقەرار، هەرەسهێنانی مەشروعییەتی دەوڵەت، سەرهەڵدانی وابەستەیی یان نەتەوەیی و خۆجێی، وەرچەرخان لە جۆرەکانی بەشداری سیاسی و هەرەسهێنانی مۆبیلیزە کردنی سیاسی نوخبەکانی جەماوەردا ببینرێت.

پێویستە بوترێت کە ئەگەرچی توێژەرانی پێشوو جەختیان لە سەر وەرچەرخانێتی کولتووری سیاسی کردووەتەوە، بەڵام بە گشتی هەڵسوکەوتی پارێزەرانەی ئەم کەسانە لە هەمبەر ئەم بابەتەدا بووە هۆی ئەوەی کە زۆرتر جەخت لە سەر وەستاوی کولتووری سیاسی بکەنەوە. بە هەر حاڵ جیاوازیی هەست پێکراوی کولتووری لە بنەما و ئاراستە گیرییەکانی سیاسی نەتەوەکاندا بەدی هاتووە و کولتووری سیاسیش وردە وردە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەگەرچی بگۆڕەکانی خوێندنەوەی ئابووری سیاسی و کولتووری سیاسی لێك جیاوازن، بەڵام ناکرێ نکۆڵی لە سەر پەیوەندی نێوان ئەم بکەین. زۆر جار، کولتووری سیاسی بگۆڕێکی دەستێوەردەرە کە یارمەتی زیاد بوون یاخود کەم بوونەوەی کارامەیی و مەشروعییەتی سیستەم دەکات. یەکێك لە خەسڵەتەکانی ماتریالیزم. ڕوانگەیەی کۆمەڵایەتییەکەیە کە کاریگەری لە سەر ڕەفتاری دەنگدەران و ئاراستەگیرییان دەنوێنێت. کولتووری یان مودێرن، کولتوورێکی بەبێ نموونەیەکی دیارکراوی وەرچەرخانە سیاسییەکانە. ئەم کولتوورە وێنەیەك لە لێکترازانی گۆڕانی فرە لایەنەکانی بنەماکان، سیستەمی پەروەردە و بڕواکان دەخاتەڕوو، بە چەشنێك کە لەم جۆرە بارودۆخەدا ناتوانین میتۆد و نموونەیەکی یەکسان و بەردەوام بۆ بە کۆمەڵگا بوونی سیاسی دەستنیشان بکەین.

## ئاستەکانی شیکردنەوە لە خوێندنەوەی کولتووری سیاسیدا:

کولتووری سیاسی چەمکێکی گشتگەرایە کە پێویستی بە شیکردنەوە و خستنە ڕووی تیۆری لە ئاست مایکرۆدایە. (واتە لە ئاستێکی بەرز). لەم کاتەدا دەتوانین



پەیوەندی لە نێوان ئاستی مایکرۆدا دروستبکەین. لە ئاستی مایکرۆدا، فۆرم و دامەزراوە سیاسییەکان و جۆراوجۆرەکانی ڕەفتاری خوێندنەوەی بۆ دەکرێت. ئەم ئاستەی خوێندنەوە گشت چالاکییە سیاسییەکان و ڕێساکانی پەسەندکراوی گەمەکردن لە لایەن زۆرینەی خەڵکەوە، فەراهەم دەکات. لە ئاستی مام ناوەندیدا [واتە لە نێوان میکرۆ و ماکرۆدا]. کولتووری سیاسی مایکرۆ و میکرۆ پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا هەیە. لە ئاستی میکرۆدا، چالاکییەکانی ڕۆژانە و ئاساییانەی سیاسی خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، ڕێساکانی گەمەکردن بە کۆمەڵێك پرۆسەی درێژخایەن هەژمار دەکرێن و گرووپە جۆراوجۆرەکان لە سیستەمی سیاسیدا بە پێچەوانەی بەها حەیەوییەکان لە سەر ئەم ڕێسایانە ڕکابەرێتی یەکتر دەکەن. بەم جۆرەش ڕێساکانی گەمەکردن لە ئاستی مامناوەندیدا لە نێوان میکرۆ و مایکرۆدا جێ دەگرێتەوە. ئەگەر گۆڕانکارییەکان لە ئاست میکرۆدا لە ڕێگەی هەمووارکردن و ڕێکخستنەوەی ڕێساکان لە سیستەمدا جێ نەگرنەوە، ئەگەری ناسەقامگیری سیستەم ڕوودەدات و لەوانەیە هەڕەشە لە کولتووری سیاسی دروستبێت. ڕوودانی شۆڕش نموونەیەکی بەرجەستە لە ناتوانایی بۆ هێنانەدی هاوسەنگی لە نێوان ئەم ئاستانەدایە. ئەم بارودۆخە واتە کولتووری سیاسی مایکرۆ توانای پاراستنی کردە مەشروعەکانی سیستەمی نییە. لەم بارودۆخەدا، دەسەڵاتی کولتووری سیاسی مایکرۆ دادەڕووخێت و بوار بۆ سەر لە نوێ پێناسەکردنی کولتوور دەرەخسێت.

## شیکردنەوەی جیو پۆلیتیکانەی کولتووری  سیاسی:

لە پرۆسەی خویندنەوەی کولتووری سیاسیدا، پیۆیستە ڕەهەندە جیوپۆلیتیکەکانی ڕەچاو بکرێن، چونکە بگۆڕەکانی کولتووری سیاسی لە ڕووی چۆنێتی بنەماکان و ئاراستەگیرییەکانی خەڵك لە هەمبەر سیستەمەوە پەیوەستە بە پێگەی جیاوازی جیو پۆلیتیکی هەر یەك لەم بگۆڕانە.





زۆرێك لە كۆمەڵگاكانی رۆژهەڵاتی میراتگەی كولتوورێكی سیاسی پشت بەستراو بە دەوڵەتی ناوەندگەرا و ستەمكارن كە بەها سیاسییەكانیان لە بوونی نوخبەگەلێكی سەربازی و كارگێریدا دەبینین. هەڵبەت، گرتنەبەری ئاراستەگەلی بەهاییانەی نوێ لە ژێر سێبەری نوێگەری سیاسیدا بە مانای لە ناو بردنی بەهاكانی پێشوو نییە، بەڵكو بەهاكۆن و نوێیەكان دەتوانن پێكەوەبژین و لە زۆرێك لە كۆمەڵگا هاوچەرخەكاندا نوخبە سیاسییەكان لە رێگەی سەرچاوە تەقلیدییەكانەوە مەشروعییەت بۆ كار و كردەوكانیان بەدەستدەێنن. هەندێ جار نوێگەری سیاسی لە رووی بەرفراوان بوونی بەشداری و هۆشیاری سیاسییەوە ژیانێكی نوێ بە دامەزراوە تەقلیدییەكان دەبەخشێت. ئەنجامی ئەم بارودۆخەش سەرهەڵدانی كولتووری سیاسی تێكەڵاوە دەكرێ رەگەز گەلێك لەم كولتوورە تێكەڵە بەهێزگەر یا خود بە پێچەوانەوە لاوازكەری بنەما و ئاستە گیرییەكی تایبەت بن.

بۆ نموونە، ئەگەر بمانەوێت وێنەیەكی دروست لە كولتووری سیاسی ئەفریقیا بخەینەڕوو پێویستە لەسەر سێ میراتی لێك جیاوازی مێژوویی واتە دامەزراوە و نەریتەكانی پێش كۆلۆنیال، ستراكتۆرە كارگێری، ئابووری و كۆمەڵایەتییەكانی قۆناغی كۆلۆنیال و ئەزموونی دژی كۆلۆنیال و دامەزراوە و سیاسەتی پاش كۆلۆنیال، جەختیان لەسەر بكرێتەوە. نەریتەكانی پێش كۆلۆنیال لە وڵاتانی ئەفریقیادا فرە چەشنن و لە هەندێكیاندا ئاسەواری بەها دیموكراسییەكان دەبینرێن. لە ناوچەكانیتری ئەفریقیادا كە نەریتی پلە بەندی (سلسلە مراتب) و باڵا دەست بوو و ئاسەواری رەفتاری دیموكراتیك نابینرێت، ستراكتۆرە دەسەڵاتخوازییەكانی حكوومەتی كۆلۆنیالی ئەم رێڕەوەی بەهێزتر كردووە. ئەگەرچی لە ناو هەندێ لە نوخبە سیاسییەكانی ئەفریقیادا كە لە رۆژئاوا خوێندنیان تەواو كردووە، رەفتاری دیموكراتیك دەبینرا، بەڵام وەدیعەی جیو پۆلیتیكانەی ئەزموونی كۆلۆنیالی سەبارەت بە كولتووری سیاسییەوە لە گشت شوێنەكانی ئەفریقیادا زاڵبوو. بە واتایەكیتر، ئەم جۆرە كولتوورە سیاسییە زۆرتر حاڵەتی سەپێنراوی هەبوو، نەك حاڵەتی هاوگەرایی و



یەكپارچەیی میراتی كۆلۆنیال زۆرتر مەیلی بەرەو ناوەندگەرایی و رەفتاری دەسەڵاتخوازانەی هەبوو.

پێویستە ئاماژە بكرێت كە تێكۆشانی دژە كۆلۆنیالی دەنگدانەوەی بوونی نۆرمگەلی بەرگریكردن لە هەمبەر كاربەدەستە كۆلۆنیالییەكان بوو و هیچ كاتێك نۆرمەكانی رزگاریخوازی نەتەوەیی و خودموختاری نەبوو بە ئاراستەگیرییەكی پۆزەتیفانەی بەهایی بۆ لایەنگری كردن لە دیموكراسی.

ئەگەرچی زۆرێك لە خەڵكی ئەفریقیا گومان لە دەسەڵاتی دەوڵەت دەكەن، بەڵام ئەم بەدگومانییەش زیاد بوونی رەخنە گرتن و نارەزامەندیی لێكەوتەوە كە لە رووی پرۆسەی بنیاتنانەوەی كولتوور و بەهێز كردنی دیموكراسی زۆر گرنگە. وەها دێتە بەر چاو كە لە نێوان سەرهەڵدانی قەیران لە سیستەمی كۆندا و قایم بوونی سیستەمی نوێ. هەستیارترین قۆناغی پەروەردە كردنی سیاسی بۆ بنیاتنانەوە یاخود نوێكردنەوەی كولتووری سیاسی فەراهەم بووە. یەكێك لە خاڵە زەقەكانی كولتووری ئەفریقیا نەبوونی هاوبەندی لە نێوان نوخبەی سیاسیدا بوو، بە چەشنێك كە هێچ جۆرە پێگەیەكی سەقامگیری جەماوەریان نەبوو. تەنیا فاكتەری پێكەوە گرێدانی ئەم نوخبەیە ئامرازی دەسەڵات بوو. سیستەمە مەرجدار و دیموكراسییەكان كە وەك میراتی كۆلۆنیالی لەم كیشوەرەدا ماونەتەوە، مۆركی دەرەكییان پێوە دیارە، هەر بۆیەش بە هۆی دروست تێنەگەیشتن لە بنەماكانی دیموكراسی مەشروعییەتێكی ئەوتۆیان نییە. لە راستیدا نۆرمە دیموكراسییەكان لە پانتایەكدا دەردەكەون كە بوونی هەرجۆرە نموونەیەكی هاوردە رەتدەكاتەوە. سروشتییە كە لەم جۆرە دۆخەدا هێچ كاتێك كولتووری سیاسی لیبرال ناتوانێت زەمینەی لە باری بووژانەوەی هەبێت. بەم جۆرەش، هێدی هێدی بە هۆی نەبوونی لێبووردەیی سیاسی، زیادبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت، بچووك بوونەوەی كۆمەڵگا و بە كەسی بوونی سیاسەت دامەزراوە هۆی ئەوەی كە بە نەبوونی مەشروعییەتی سیاسی، نموونەكانی دەوڵەتی دەستەڵاتخواز، میراتگر، خراپ بە كارهێنانی دەسەڵات و سەركوتی سیاسی بەردەوام بێت.





سەبارەت بە ئەمریکای لاتین پێویستە ئاماژە بدرێت کە بنیاتنانی کولتووری سیاسی جیاوازی بڕیوە. دوای شەڕی دووەمی جیهانی، ئاراستە گیرییە نوێیەکانی کاسۆلیزیزم سەبارەت بە سیاسەت لە لایەن لایەنگرانی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و پارتە دیموکرات مەسیحییەکانەوە و دواتریش لە لایەن ((بزاڤی ئیلاهیاتی رزگاریخواز))ەوە پێشکەش (بە کۆمەڵگا) کران. ئەم دوو بزاڤە لە مێژووی کەنیسەی رۆم دوور کەوتنەوە و دژی دیموکراسی لیبرال وەستانەوە.

لە سەرەتای شەستەکاندا، دیموکرات مەسیحییەکان لە ژێر کاریگەریی ((شووڕای ڤاتیکان — ٢)) بوون کە تیایدا نایەکسانی ئابووری مەحکوم دەکرد و کەنیسەی لە هەمبەر دیموکراسی سیاسی پابەند دەکرد. جێی وەبیر هێنانەوەیە کە هەر دوو بزاڤەکە، بەرپەرچدانەوەی بەهێز بوونی مارکسیزمی شۆڕشگێڕانە بوون. بەڵام لە رووی پراکتیکەوە ئەم بزاڤە بەرەو بەهێز کردنی روانگە رادیکالییەکانی کەنیسەی ئەمریکای لاتین چەمایەوە و کەوتە ژێر کاریگەری دەستڕۆیی رۆشنبیر مارکسیستییەکان و تیۆرییەکانی وابەستەیی.

لە پرۆسەی کۆمەڵگابوونی سیاسیدا و لە چوارچێوەی کولتووری سیاسی ئەمریکای لاتین، بانگەشەکانی کەنیسە بۆ نەهێشتنی پێداویستی هەژاران و بیرۆکەکان بزاڤی ئیلاهیاتی رزگاریخواز بۆ بەرز کردنەوەی هۆشیاریی سیاسی و بەشداریکردنی هەژاران لە ئاستێکی نزمدا بوو. لە بەرێوەبردنی ئەم کارانەدا، ناوەڕۆکی پلەبەندییانەی (سلسلە مراتبی) دەسەڵاتی کەنیسەی کاسۆلێك کەوتە ژێر پرسیارەوە.

بەراورد کردنی داتاکان سەبارەت بە مەکزیك، کاستاریکا و نیکارگوا دەربڕی بووژانەوەی بێ وێنەی کولتووری سیاسی دیموکراتیکە. ئەمەش دەکرێ لە پشتگیریکردن لە بەشداریی سیاسی، ئازادییە مەدەنییەکان و بەرگریکردن لە مافی بەرهەڵستکاران ببینرێت. سەبارەت بە مەکزیك، توێژینەوەکان دەردەخەن کە سەرەڕای بوونی پێشینەی دەسەلاتخوازی لەم وڵاتەندا، بە هۆی گۆڕانکاریی کولتووری و



وەرچەرخان لە پرۆسەی بە کۆمەڵگابوونی سیاسیدا، هاووڵاتیان خاوەنی ئازادییە مەدەنییە دیموکراتیکەکان و مافی بەشداریی سیاسین. سەرەڕای چوار دەیە ئەزموونی دیموکراسی لە کاستاریکادا، نیکاراگوا خاوەن مێژوویەکی دوور و درێژی دەسەلاتخوازییە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، توێژینەوە ئامارییەکانی دەیەی هەشتا دەربڕی پێشکەوتنی رەوتی دیموکراسی لە نیکاراگوایە بە بەراورد لەگەڵ کاستاریکادا. کۆی ئەم توێژینەوانە دەربڕی ئەوەن کە پێویستە چاوخشانەوە بکرێت بە پەیوەندی نێوان کولتووری سیاسی و جۆری حکوومەت و رێگاکانی بەردەست و فرەلایەن بۆ وەرچەرخانی کولتووری سیاسی. لە کاتێکدا کە لە کاستاریکا رووبەڕووی دەستڕۆیی دوو لایەنەی کولتووری نوخبەکان و جەماوەر، هەروەها گەشەسەندنی دامەزراوەیی دەبینەوە، بەڵام لە مەکزیك و نیکاراگوا سەرهەڵدانی کولتووری سیاسی دیموکراتیك بە نەوەیەك بووە لە دژی دەسەلاتخوازیی تەقلیدیی.

بابەتی سێیەم خوێندنەوەی کولتووری سیاسی ئەورووپای رۆژهەڵاتە. توێژینەوەکان لەسەر ئەم ناوچەیە دەربڕی سەرنەکەوتنی حکوومەتە کۆمۆنیستییەکان لە هێنانەوەی مەشروعییەت بووە، جۆرە ناکۆکییەکی ئاشکرا لە نێوان رەفتاری کۆمەڵانی خەڵك لە پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵات و کولتووری سیاسی شاراوەی گرووپە جۆراوجۆرەکان لە بەرگریکردن لە هەمبەر رەفتاری حکوومەت دەبینرێت. بە دوای چاکسازییەکانی گۆرباچوف و درزکردنی ئەم چاکسازییانە بۆ ئەورووپای رۆژهەڵات، ترسی خەڵك نەما و گوێڕایەڵی بێ چەند و چۆن لە نوخبە سیاسییەکان واتا و گرنگییەکەی لەدەستداو بە خستنە ژێر پرسیاری دەسەلاتی سیستەم، بناغەکانی مەشروعییەت حکوومەت سست کرا. لەم بارودۆخەدا، لە بڕواکان. سیستەمی بەها و بنەماکانی (مقدمات) خەڵك گۆڕانێکی بنەڕەتی روویدا و، کولتووری سیاسی پەیڕەو بۆ کولتووری مەدەنی گۆڕدرا.

بەم جۆرە، دەبینین کە هەر یەك لە یەکە سیاسییەکان ئەزموونێکی جیاوازیان لە رووی پەیوەندی نێوان سیستەم و ژینگەکەیاندا هەیە. خودی هەڵسوکەوتی (تواصل) ستراکتۆری دەتوانێت لە رەوتی پێکهێنانی کولتووری سیاسی و پرۆسەی بە





کۆمەڵگای بوون رۆڵی سەرەکی بگێڕێت، ئەم رەوتەش لە ئاراستەکانی خەڵك و تێگەیشتنیان لە رەفتار و کارکردی سیستەمی سیاسی نێودەوڵەتی دەتوانین لە ئاست سیستەمی نێودەوڵەتییەوە خوێندنەوە بۆ تیۆری و نموونەکانی کولتووری سیاسی بکەن، چونکە کولتووری سیاسی نێودەوڵەتی بە شێوازی جۆراوجۆر فۆرمەکانی بە سەر ئاکتەرە حکوومییە فەرمی و نافەرمییەکان بسەپێنێت و کولتووری سیاسی هەندێ لە ئەکتەرەکانیش دەتوانێت بۆ ئاستی نێودەوڵەتییەوە دزە و گشتاندن بکرێت. بۆ نموونە، تا پێش شەڕی دووەمی جیهانی نموونەی زاڵ بە سەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا (سەرەڕای بوونی دوو وڵاتی کۆمۆنیستی لە جیهاندا. واتە یەکێتی سۆڤیەت و مەغولستانی دەرەوە) بە پیتی کولتووری سیاسی سەرمایەداریی و لیبرال پێناسە دەکرا، چونکە زۆربەی وڵاتنی جیهانی سێیەم لە رێگەی کۆلۆنیالەوە بەڕێوە دەبردرا و خاوەن شوناسی کولتووری سەربەخۆ نەبوون. دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی و پێکهاتنی سیستەمی دوو جەمسەریی، رووبەڕووی تێکەلێك لە کولتووری سیاسی سۆشیالیستی و سەرمایەداری دەبینەوە، بە چەشنێك کە هەر یەك لەم جەمسەرانە هەوڵی گشتاندن و سەپاندنی کولتووری و ئایدیۆلۆژیاکەی بەسەر ئەکتەرەکانیتری دەدا. لەم بارودۆخەدا، ئەو پێناسانەی کە لەشەڕ و ئاسایش، هاوسەنگی هێز، بەرژەوەندی نەتەوەیی و... دەدرا، بە پێی خەسڵەتەکانی کولتووری سیاسی هەر یەك لەم دوو جەمسەرانە بوون. ئاراستەگیرییەکانی وڵاتان زۆرتر لە ژێر کارێگەری نۆرم، بەهاوسیستەمی ئایدیولۆژیکی شەڕی سارد بوو و رێساکانی گەمەی نێودەوڵەتی هەڵقولاوی کولتووری سیاسی باڵادەست بوو کە دەوڵەتانی ناچار دەکرد پابەندی شێواز و نەریتە دیارکراوەکان بن. ئاسەوارەکانی سەپاندنی کولتووری سیاسی لە سەپاندنی ((شێوازی بووژانەوەی سەرمایەداریی)) و ((شێوازی بووژانەوەی ناسەرمایەداری))دا دەبینین.

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، کولتووری سیاسی وەستا نییە و بەپێی گۆرانکاری لە ناوەڕۆکیدا لە بڕوا، بنەما و بەهاکان، گۆڕانی بەسەردا دێت. هەر



بۆیەش پێویستە بزانین لە ئاست مایکرۆدا سیستەمی نێودەوڵەتی کولتووری سیاسی نەگۆڕ نامێنێتەوە. شیکردنەوەی نموونەکانی رەفتاری و رێساکانی گەمەکردن لە قۆناغی سیستەمی دوو جەمسەریدا، دەربڕی گۆڕانی بنەما و ئاراستە گیرییەکانی قۆناغی یەکەم و دووەمی شەڕی سارده. لەم دوو قۆناغەدا ستراتیژی دەوڵەتان گۆڕانی بە سەردا هات و وەرچەرخانی ریشەی لە شێوەی هاوپەیمانییە نێودەوڵەتییەکاندا روویدا. هەڵبەت پێویستە لە بیر نەکەین، کە لە میانەی ئەم گۆڕانکارییانەدا، لە ئاست میکرۆشدا وەرچەرخانێك لە کولتووری سیاسیدا روویدا، بۆ نموونە تیۆری ((پێکەوە نەگونجانی سۆسیالیزم و سەرمایەداری)) کە چەندین جار لە لایەن چینییەکانەوە خرایەڕوو، بەرەو هاوکاریکردن لەگەڵ رۆژئاوادا گۆڕدرا. لە قۆناغی یەکەمی شەڕی سارددا، زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم لە ترسی سەپاندنی نموونەگەلی رەفتاری زلهێزەکان و بەرگری لە هەمبەر سەپاندنی کولتوور، چوونە پاڵ ((بزاڤی بێ لایەنەکان (عدم الأنحیاز))) تا لە کەوتنە ژێر کاریگەری کولتووری سیاسی نێودەوڵەتی پارێزراو بن. بەڵام چونکە جۆراوجۆری کولتووری سیاسی وڵاتانی جیهانی سێیەم نەیتوانی بنەما و نموونە رەفتارییەکانی ئەم وڵاتانە بکات بە کولتوورێکی سیاسی مایکرۆ [واتە گشت ئەم وڵاتانە خاوەن یەك کولتووری سیاسی بن] بۆیە ئەم بزاڤە کەوتە ژێر کاریگەری کولتووری سیاسی باڵادەستی جیهانی و لە زۆر وڵاتدا بوو بە کولتوورێکی پەیڕەو.

پێویستە ئاماژە بکرێت کە لە قۆناغی شەڕی ساردد سەرەڕای بوونی کولتووری سیاسی باڵادەستی جیهانی، نموونەی رەفتاری زۆرێك لە سیستەمە لاوەکییەکانی (subsystom) نێودەوڵەتی وەك رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، رۆهەڵاتی دوور، ئەفریقیا و ئەمریکای لاتین تایبەتمەندییەکانی کولتووری سیاسی خۆیان پاراست، بە چەشنێك کە لەم قۆناغەدا، ئاراستە و تێگەیشتنی وڵاتانی ئەم ناوچانە لێکتر جیاواز بوون و هەر یەك خاوەن تێگەیشتنێکی خەڵك بۆ سیستەم، بەرپرسیارێتی و کارکردەکان بە بەردەوامی گۆڕانی بە سەردا هاتووە و نموونەگەلی رەفتاری نوێ سەر هەڵدەدات، لە





سیتەمی نێودەوڵەتیدا بە کۆمەڵگا بوونی سیاسی نوێ دەبینینەوە کە تا ڕێژەیەکی زۆر هەڵقولاوی سەرچاوە و پاڵنەرە ناوخۆییەکانە. بەڵگە نەویستە کە چۆنێتی ئەم پرۆسەیە لە نێوان جەماوەر و نوخبە سیاسییەکاندا جیاوازە. بەواتایەکیتر، نوخبە سیاسییەکان خێراتر دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم پرۆسەیەدا، بە چەشنێك کە تەنانەت لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتووی ڕۆژئاواشدا سەرلەنوێ بە کۆمەڵگا بوونی سیاسی جەماوەر لەسەرخۆتر و درێژترە لە بەراورد لەگەڵ نوخبە سیاسییەکاندا. بۆ نموونە، ئەو ڕاپرسییانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا بۆ چوونە ناو یەکێتی ئەورپادا ئەنجامدران، دەربڕی جیاوازی ڕوانگەکانە لە نێوان جەماوەر و نوخبەی سیاسیدا سەبارەت بە پێکهێنانی یەکێتی ئەوروپا، هەروەها کە دەبینین سەبارەت بە دانوساندنەکانی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و عەرەبەکاندا. کولتووری سیاسی ناوچە عەرەبییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست، بە بەراورد لەگەڵ دەیەی ڕابردوودا، وەرچەرخانی گەورەی بەخۆوە بینیووە و لەمیانەی پرۆسەی سەرلەنوێ بە کۆمەڵگا بوونی سیاسیدا، بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا وڵاتانی ئەم ناوچەیە ستراتیژی جیاوازیان پەیڕەو کردووە. شایانی ئاماژە پێدانە کە هەروەك ئەوروپا، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاستیشدا لە نێوان ئاستی سەرلەنوێ بە کۆمەڵگا بوونی نوخبە سیاسییەکانی جیهانی عەرەبی و جەماوەردا بۆشاییەکی گەورە هەیە.

هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، ژینگەیەکی بەهاییە و ڕێژەی بە سیاسی بوونی کولتوور پەیوەندی بە چونێتی پەیوەندی نێوان ستراکتۆرە جۆراوجۆرەکانەوە هەیە. ڕێژەیی لێهاتوویی سیمبولێکی (رمزیە) سیستەم لە پێکهێنانی کولتووری سیاسی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیدا کاریگەرە، بە چەشنێك کە هەندێ لە سیمبولەکان یارمەتیدەری مەشروعییەت بەخشین بە کارکردەکانی سیستەمێك دەربڕی سەرهەڵدانی کولتوورێکی سیاسی نێودەوڵەتی یاخود هەرێمن. لەم بارودۆخەدا، کولتووری سیاسی دەتوانێت دیارخەری ڕێساکانی گەمەکردن و پاڵنەرەکانی ڕەفتاری نێودەوڵەتی بێت.



## ئەنجامەکان:

کولتووری سیاسی بە یەکێك لە نموونە گرنگەکانی توێژینەوەی پرۆسەی گەشەسەندنی سیاسی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا هەژمار دەکرێت. ڕوانگەی خەڵك و نوخبەکانی کۆمەڵگا بۆ سیاسەت، تێگەیشتنیان لە ڕەفتاری سیستەمی سیاسی و ئاراستە گیرییەکانی خەڵك، پەیوەستن بە خەسڵەتە کولتوورییەکان و پرۆسەی بە کۆمەڵگا بوونی سیاسییەوە. وەرچەرخانی کولتووری سیاسی و کارکردن فاکتەرە سەرەتایی و دووەمییەکانی (عوامل اولیە و ثانویە) بە کۆمەڵگابوون لە چونێتی ڕۆڵگێڕاندا کاریگەرە و دەتوانێت بەرەو بەرز بوونەوە یاخود دابەزینی بەشداریی سیاسی کۆتا بێت و تاك لە هەمبەر ستراتیژی، سیاسەت و بڕیارەکانی سیستەم هەستیار یا خود بێ لایەن (عدم الأنحیاز) بکەن. بەم جۆرە، چونێتی و چەندایەتی بە کۆمەڵگابوون و سەرلەنوێ بە کۆمەڵگابوون لە ڕووی شێوازی بەکارهێنانی سیمبولەکان و ناسینی ناەڕۆکی کولتووری سیاسی، پشکی زۆری لە بەهێزکردن یاخود لاوازکردنی دیموکراسی و دیکتاتۆریدا هەیە و بەرەو هەڵبەزین یاخود دابەزینی متمانەی دوولایەنەی حکوومەت و خەڵك کۆتا دێت.

تا ئەو کاتەی کە بەوردی لە ناوەڕۆکی کولتووری کۆمەڵگا نەکۆڵێنەوە، ناتوانین بە دروستی دیار بکەین کە چ بەشگەلێك لە کلتوور توانایی بە سیاسی بوونی هەیە، چونکە گشت کاتێك ناتوانین وەها چاوەڕوان بکرێن کە گشت بگۆڕە (متغیر)کولتورییەکان بە یەك ئاست خاوەن توانایی شاردراوەی (بالقوە) سیاسی بن. بەم جۆرەش نەبوونی زانیاری تەواو لەسەر بەها سیمبول و سیستەمی بڕواکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشگەلێك لە کلتوور کە مەیلیان بۆ بەسیاسی بوون نییە، (بە سیاسی) بکەین، کە بەم چەشنە سیستەمی سیاسی ڕووبەڕووی قەیرانی داواکاریی و وەڵامدانەوە دەبێتەوە. هەروەها، ئەگەر بێتو بە نەزانینەوە ڕەگەز گەلێك لە کولتوورکە مەیلیان بۆ بە سیاسی بوون هەیە لە حاڵەتی ((ناسیاسی)) بووندا بە جێ بهێڵین، بەم جۆرە نەمانتوانیوە لە تواناییە شاردراوەکانی کولتووری بۆ بەهێز کردنی





بەشداری سیاسی کەڵك وەرگرین و توانایی پاڵاوتن (استخراج)ی سیاسی و کولتووری کۆمەڵگا هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. لە درێژ خایەندا ئەم بارودۆخە لە کارایی سیستەمی سیاسی کەمدەکاتەوە و قەیرانی مەشروعییەت سەر هەڵدەدات.

ئەمڕۆکە هەڵسوکەوتی جەبرییانە لەگەڵ کولتووری سیاسی بەسێ هۆیەوە ڕەت دەکرێتەوە:

**یەکەم:** کولتووری سیاسی ستراکتۆری حکوومەت و کارکردەکانی دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە و توێژینەوەکان دەربڕی ئەوەن کە ڕەهەندەکانی زانین و بنەماکان (مقدمات) و لایەنی دادوەری کولتووری سیاسی، لەوانە لە بەرپەرچدانەوە بە کارکردی سیستەم و ئەزموونە مێژووییەکان بکێشمانی (انعطاف) هەبێت و لە پرۆسەی سەرلەنوێ بە کۆمەڵگابوونی سیاسیدا گۆڕانی بەسەردا بێت. بە بەردەوامی بوونی زۆرتریان هەیە لە بەرپەرچدانەوەیی بە ئەزموونە مێژووییەکان و گۆڕانکارییە دامەزراوییەکاندا لە سەر خۆتر دەگۆڕێن.

**دووەم:** توێژینەوەکان سەبارەت بە ڕێرەوی دیموکراسی لە ژمارەیەك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم دەربڕی ئەوەیە کە ئەگەرچی کولتووری سیاسی کاریگەری لەسەر تایبەتمەندی و بەردەوام بوونی ژیانی دیموکراسی بەڵام ناکرێ ڕۆڵی فاکتەر گەلی وەك پەروەردەی سیاسی بەپێی ئەزموونە مێژووییەکان، وەرچەرخانە دامەزراوییەکان و سەرلەنوێ بە کۆمەڵگا بوونی سیاسی، گۆڕانکارییە قووڵەکانی ئابووریی، ستراکتۆرە کۆمەڵایەتییەکان و فاکتەرە نێودەوڵەتییەکانی وەك دەستڕۆیی کولتووری بێگانە و کۆڵۆنیال ڕەچاو نەکەین.

**سێیەم:** بوونی جۆرە دەمارگرژییەك لە هەمبەر کولتووری سیاسی و نەبوونی ئامادەیی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەر جۆرە وەرچەرخانێك دەبێتە هۆی ئەوەی کە وەها وێنا بکەین کە زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم ناچار بە پەسەندکردنی سیستەمی دەسەڵاتخوازین. بەڵام لە پراکتیکدا سەلمێنراوە کە ئەم جۆرە بەڵگاندنە دوورە لە ڕاستی.



# بەشی حەوتەم

# بەربەستەکانی پلان دانان و دیموکراسی

پلان دارێژی ئابووریی، لە شێوە گشتگیرەکەیدا، تایبەتە بە کۆمەڵگا سۆشیالیستەکانەوە کە بەپێی ئەم پلانە دامەزراوەیەکی ناوەندی پلاندانان سەبارەت بە دابەشکردنی سەرچاوەکان و گشت بەرهەمە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا بڕیار دەردەکات و بە ڕەچاوکردنی ڕێژەییانەی داواکاریی بەکاربەران، ماشێنی ئابووریی وڵات بەرەو ئامانجە دیاریکراوەکان، ڕێنمایی دەکات.

دوای شەڕی دووەمی جیهانی، زۆرێك لە وڵاتە سەرمایەدارییەکانی ڕۆژئاوا، پلان-دانانی ئابوورییان بە شێوازێکی سنووردار خستە ناو پرۆسەی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە بە چەشنێك کە ئەم نموونەیە لەگەڵ بەهاکانی زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا ناکۆك نەبێت. بۆیە پرسی سەرەکی لە بەردەم دیموکراسییەکانی ڕۆژئاوادا، مەوارد و ڕادەی بەکار هێنانی ئابووریی پلان بۆ دارێژراو و ڕادەی دستێوەردانی دەوڵەت لە کاروباریی ئابووریدا بوو، چونکە ئەم وڵاتانە کە پەیڕەوی لە ئابووری سەرمایەداری دەکەن، پلاندانانی ئابووری لە دژی تاکگەرایی و سیستەمی ئابووری ئازاد دەزانن.

لە ئارادا بوونی بارودۆخی پۆلۆرالیستی بوونی دامەزراوگەلی خاوەن بەرژەوەندی جوراوجۆر (متعدد). گرووپی گوشار، یەکێتییە کریکارییەکان، کۆمپانیا بازرگانی و داراییەکان، تەکنوکرات و سیاسەتمەداران کە هەر یەك لە مانە، ستراتیژی و بۆچوونی جۆراوجۆریان لە پرۆسەی دابەشکردنی سەرچاوەکاندا پەیڕەویی دەکەن، پلان دارێژەران دەخەنە بارودۆخێکی سەختدا و لەم ڕەوتەدا ڕەفتاری دژبەیەك دەبنە هۆی ئەوەی کە حەز و داواکارییە گشتییەکان بکەونەوە ژێر دەستی حەز تاکی و گرووپییەکاندا. ڕادەی پەسەندکردن و بەکار هێنانی نموونەکانی پلان دانان لە نێوان گرووپە جۆراوجۆرە سیاسییەکاندا جیاوازە، بە چەشنێك کە نموونەی پلاندانان لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای پارتی کرێکارانی بەریتانیا زۆرتر سازگار لە بەراورد لەگەڵ پارتی پارێزگاری ئەم وڵاتەدا.

لەو ڕووەوە کە یەکێك لە لایەنەکانی سیاسەت تێگەیشتن لە واقعییاتی ئامانجە فرە ڕەهەند و جیاوازەکانە و دابەشکردنی سەرچاوە ئابوورییەکان زۆرجار وەك سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی دەسەڵات و بەهاکان هەژمار دەکرێت، بۆیە

هەرجۆرە گۆڕانکارییەك لە ناوەڕۆکی پلاندانان و بودجەدا زنجیرە ئاسەوارێکی سیاسی لێدەکەوێتەوە.

لەم توێژینەوەیەدا زۆرتر جەخت لە سەر لایەنە سیاسییەکانی پلاندانان و بودجە دەکرێتەوە، نەك چەمکە وردە ئابوورییەکان کە لەسەر لایەنە ئەقلانی و لۆژیکگەراییدا دامەزراوە، چونکە زۆرێك لە فاکتەر گەلی دامەزراوەیی و سیاسی هەن کە بەکارهێنانی شیکردنەوەی ئابووری رووبەڕووی گرفت و سنووردارێتی دەکەنەوە. بۆ نموونە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا زۆرجار مشتومڕ لە نێوان کۆنگرێس و سەرۆك کۆماردا روو دەدات کە بەشێك لە ناکۆکییە لە فریگەری سیاسییەوە هەڵدەقوڵێت، بە چەشنێك کە هەردوو پارتی کۆماری و دیموکرات لەسەر دیارکردنی هێڵی روون و ئاشکرا لە نێوان یەکتردا پێ دادەگرن. ئەندامانی کۆنگرێس کە زۆرتر هەوڵی راکێشانی رەزامەندی لایەنگرەکانیان دەدەن، زۆرتر دەربڕی خواستە خۆجێیەکانن و رەچاوی ستاندەرەکانی کارامەیی ئابووریی ناکەن. پرۆسەی بڕیاردانی دابەشکردن دەبێتە هۆی هێنانەدی هەستیارییەکی زۆر، بارودۆخێك کە (وایلداوسکی) بە ((لۆژیککگەرایی سیاسی)) ناوی دەبات. هەر بۆیە سەبارەت بە کۆنگرێسی ئەمریکا، کارامەیی ئابووری سەبارەت بە تێچوونەکان دەکەوێتە ژێر کاریگەری رادەی پشتگیری سیاسی لە تێچوونەکان. ئەگەر چی ئەو بڕیارانەی کە لە چوارچێوەی پلان-دانان و بودجە دارێشتن دەردەکرێن لایەنی دابەشکردنیان هەیە، بەڵام هەندێ کەس وەك ((ماس گریۆ)) لە سێ ئاستدا ئەم بڕیارانە لێك جیاواز دەکاتەوە:

١- بڕیارە پسپۆرێتییەکان (تخصصی) کە پێشکەشکردنی هەندێ خزمەتگوزاری بۆ ئامانجگەلێك وەك بەرگریکردن، تەندروستی گشتی، پەروەردە و... لە خۆ دەگرێت.

٢-بڕیارە سەقامگیرکردنەکان کە بەرەو بەرقەرارکردنی سەقامگیری ئابووری کۆتا دێت و بە مەبەستی کونترۆڵ کردنی چالاکییە گشتییەکانی ئابووری لە رێگەی تێچوونەکانەوە دەردەکرێت.



٣- بڕیارە دابەشکردنەکان کە لەمیانەیدا رادە و سنوور و تێکەڵکردنی داهاتەکان لە نێوان گرووپ و ناوچە جۆراوجۆرەکاندا دیار دەکرێت. ئەگەرچی گریۆ لە نێوان ئەم بڕیارانەدا جیاوازی دادەنێت، بەڵام بێگومان لە جیهانی واقیعیدا، بە تایبەتیش بە تێکەڵ بە یەکترکردنی پلان دانان و بودجە، ئەم لێك جیاکردنەوەیە نامومکینە و گشت بڕیارەکان لە پۆلێن کردنی بڕیارە دابەشکردنەکاندا جێ دەگرنەوە.

ئەزموونەکانی رابردوو نیشاندەدەن کە بە درێژایی قۆناغێکی دوور و درێژدا. پلاندانان و بودجە دارێشتن خاوەن ئامانج، بەرژەوەندی و حەزی جۆراوجۆر بوونە و بارودۆخێکی رکابەرێتیدا.

بەپێی نەریت، هەریەك لەم دوو پرۆسەیە پەیوەندییان بە سەرچاوەکانی خۆیانەوە هەبوو، واتە بودجە سەرقاڵی تێچوونە گشتییەکان بوو و پلاندانانیش سەرقاڵی بابەتە فیزیکییەکان. بودجە رەچاوی دارایی ساڵانەی دەکرد، بەڵام پلاندانان جەختی لەسەر پرۆژەکانی چەندین ساڵەی دەکردەوە، بودجە دارێژەران خوازیاری پاراستنی بارودۆخی بەرقەرار بوون. بەڵام پلان دارێژەران هەوڵی هێنانەدی زنجیرە پروسەیەکی نوێگەریان دەدا و خوازیاری گۆڕینی شێوازە باو و دووبارە بووەکان بوو. بودجەدارێژەران جەختیان لە سەر پشك بەندی کردنی سەرچاوە گشتییەکان دەکرد، بەڵام پلان دارێژەران جەختیان لە سەر جووڵاندنی سەرچاوە دەگمەنەکان دەکرد. بودجەدارێژەران سەر کێماسی ورد دەبوونەوە، بەڵام پلان دارێژەران جەختیان لە سەر هەلەکان دەکرد. بودجە دارشتن دەرباز بوون لە داهاتوو بوو، بەڵام پلان دانان بەدوای رێگەی رزگاربوون ئێستا دەگەڕا. بە گشتی پێویستە ئاماژە بدرێت کە بودجە دارشتن لە بارودۆخێکی تەواو پارێزگارانەدا کار دەکات، بەڵام پلان دانان ئامانجی گۆڕان و گەشە پێدانە. چونکە لە پراکتیکدا پرۆسەی بودجە دارشتن و پلان دانان رووبەڕوو دووبارەکارکردنەوە [لە سەر بودجە و پلان دانان]و تێکەڵبوونی ئەرکەکان دەبووە، بۆیە سیاسەتمەداران هاوکاری و پەیوەندی پتەو نێوان ئەم دوو کارکردەدا بە پێویستیان زانی.





بۆ نیشاندانی ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی سیاسەت دارشتن و پەیوەندی بە بڕیارە دابەشکردنەکانەوە و ئاسەواری ڕەفتاری سیاسی لە نێو ئەکتەرە جۆراوجۆرەکاندا بە تایبەتیش پلان دارێژەران، بودجەدارێژەران، بەڕێوەبەران و سیاسەتمەداران، پێویستە سەرەڕای سوود وەرگرتن لە نموونەگەلی وەك ((لۆژیککگەرایی پەتی)) یاخود ((لۆژیککگەرایی سنووردار))، سوود لە ((نموونەی ڕەفتاری سیاسی)) وەربگرین، نموونەی دوایی سەرەڕای ڕەخنەگرتن لە نموونەی یەکەم، جەخت لەوە دەکاتەوە کە پرۆسەی بڕیاردان ناکۆکی و مشتومڕێك لەخۆدەگرێ کە بە هۆی بوونی بەرژەوەندی و بەها دژبەیەکەکان ڕوو دەدات. ئەم پرۆسەیە لە سەرەتاوە تا کۆتایی لایەنی سیاسی و بەهاییانەی هەیە، بۆیە ناکرێ تەنیا لە ڕێگەی لێکدانەوە (محاسبات)ی وردەوە بە ئامانجە ئایدیالەکان بگەین. ڕوانگەی ((لۆژیککگەرایی پەتی)) بڕیارەکانی بودجەدانان بە یەکێك لە ڕەگەزەکانی پلان دانان دەزانێت کە هەوڵدەدات بەپێی ڕێسا و پێوەرەکانی کارامەیی ئابووری سەرچاوەکان دابەشبکات. لە ڕوانگەی ((نموونەی ڕەفتاری سیاسی)) بڕیاردەر ڕووبەڕووی زنجیرە ئەلتەرناتیڤێك دەبێتەوە کە لە ڕووی سیاسییەوە پێکەوە گرێدراون، هەروەها لەمپەر و بەربەستی فراوانی بۆ دروستدەبێت. دوور نییە ئەم چەشنە بارودۆخە ببێتە هۆی دەرکردنی بڕیارگەلێك کە دەتوانێت لە پرۆسەی بڕیاردەرکردندا، ئەنجامی ناشیاوی لێبکەوێتەوە. لە بەکارهێنانی ((نموونەی ڕەفتاری سیاسی)) دا بۆ دەرکردنی بڕیارەکانی تایبەت بە دابەشکردنی سەرچاوەکان، لێك جیاکردنەوەی ئامانج و ئامرازەکان کارێکی ئەستەمە. بە چەشنێك کە بە بۆچوونی هەندێ کەس شیکردنەوەی وردی ئامانجەکان بە یەکێك پێودانگە سەرەکییەکانی پرۆسەی بڕیاردان هەژمار دەکرێت، بەڵام مەرج نییە کە گشت کاتێك ئامانجەکان جێگیر و نەگۆڕ بن و نەکرێت لە پرۆسەی پلان داناندا گۆڕانی بەسەردا بێت. لە سەرەتای کاردا، کاتێك کە پلان دارێژ دەست بە بڕیار دەرکردن دەکات، لانیکەمی زانیاری لە بەردەستدا هەیە، بەڵام بەرە بەرە کاتێك کە زانیاری لە سەر سنووردارێتییە سیاسییەکان و دەرفەتەکان وەرگرت، پێداچوونەوەیەکی ڕیشەیی لە



ئامانج و ستراتیژییەکانیدا دەکات. لە خوێندنەوەو پلان دانان لە دیموکراسییەکانی ڕۆژئاوادا، ڕووبەڕووی فرە لایەنی حەز و بەرژەوەندییەکان دەبنەوە، بە چەشنێك کە هەر یەکەیان دەربڕی ویستی خۆیانن و بۆ ئەو شتەی کە لە پێناویدا هەوڵ دەدەن ستراتیژیگەلی جۆراوجۆر بەکار دێنن و زۆر جار بەرژەوەندی بەشدار بوان لە بڕیارەکانی دابەشکردندا وەپێش بەرژەوەندی گشتی دەکەوێت. وڵاتێکی وەك بریتانیا کە پلان دانانێکی سنووورداری ئابووری پەیڕەوی دەکرێت، سیاسەتمەداران لە ژێرکاریگەری گرووپە کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسییەکان، هەروەها بەپێی ڕادەی پابەندبوونیان بەم گرووپانەوە حەز و بەرژەوەندی دیارکراویان هەیە. بۆ نموونە وەزارەتی تەندروستی، پەروەردەو وزە بۆ بەدەستهێنانی بودجەی زۆرتر بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتەکانیان ڕکابەرێتی یەکتر دەکەن.لەم ڕەوتەدا سیستەم پێویستی بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی زۆرتر، پەروەردەی باشتر و سوود وەرگرتن لە سەرچاوەکانی زۆرتری وزە هەیە. بێگومان بە هۆی کەم و کوڕی سەرچاوەکان، دابینکردنی گشت ئەم خزمەتگوزارییانە لە یەك کاتدا کارێکی ئەستەمە بۆیە لە پرۆسەی دابەشکردن و تەرخانکردنی سەرچاوەکان ڕووبەڕووی زنجیرە ڕەفتارێکی کارگێڕی و سیاسی جۆراوجۆر لە پرۆسەی بڕیارداندا دەبێتەوە، کە لە ژینگەیەکی سازشکردن، بکێشمانی (إنعطاف)، ڕێککەوتن مشتومڕ و ناکۆکی کە دەنگدانەوەی بۆچوونی بەهاییانەی هەر یەك لە بەشداربوانی لە بڕیار دەرکردندایە، ئەنجامدەدرێت زۆر جار وەزیرەکان لە کۆبوونەوەکانی پلان داناندا ناڕەزایی دەردەبڕن، چونکە ئەوان لە بارودۆخێکدان کە هەم دەبێ تێچوونەکان کەم بکەنەوە، هەمیش پلانی نوێ دابڕێژن. لەوانەیە وەزارەتەکانیتر هەوڵی بەدەستهێنانی بودجەیەکی زۆرتر بدەن بۆیە ئەو وەزیرەی کە خاوەن پلان و ئامانجگەلی سنووردارە تووشی ناکامی دەبێتەوە. شیکردنەوەی بودجە دەربڕی توانایی سنوورداری وەزیرەکانە بە چەشنێك کە زۆر جار نارەزامەندی وەزیرێك ڕێگەی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی وەزیرێکیتر قەرەبوو دەکرێتەوە. ئەم نارەزامەندیە زۆرتر پەیوەستە بە ئەنجام و بەدواهاتەکانی پرۆسەی پلان





دانان تا شێوازی دابەشکردنەوەی سەرچاوەکان. بە گشتی نارەزامەندییەکانی ئەم ڕەوتە لە خەسڵەتەکانی پرۆسەی بودجە دارشتن هەژمار دەکرێت. هەروەك ((مارچ)) و ((سایمون)) ئاماژەیان پێداوە: ((سەرکردەکانی ڕێکخراو هەوڵی دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێك بۆ کردەکانی هەنوکەیی نادەن، تەنیا کاتێك نەبێت کە لە بارودۆخی هەنوکەیی نارازی بن)).

بە هەر حاڵ جیهانی بودجە دارشتن و پلان دانان پڕە لە لایەنگران. بەرگریکاران و بازرگانان لەم ڕەوتەدا، ڕۆڵی سیاسەتمەدار وەك داواکاریی (مدعی) پشکێك لە سەرچاوە دەگمەنەکان لەگەڵ ڕۆڵەکەی وەك دابینکاری ((بەرژەوەندیی گشتی)) یەکتر ناگرنەوە. بۆچوونی بەشداربوان لە پرۆسەی پلان داناندا بە دەوری لایەنە زانستی و ئایدیالییەکانی گەشەسەندی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیدا دەخولێتەوە یەکێك لەو پرسیارانەی کە لێرەدا گەڵاڵە دەبێت ئەوەیە کە تا چ ئاستێك بەشداریکەر لە پرۆسەی بڕیاردان و پلان داناندا بۆچوونەکانی دەربڕێت؟ چۆن بۆچوونە دژ بە یەکەکانی بەشداربوان بەبێ بوونی دەزگایەکی پلان دانانی ناوەندی وەك ئەوەی کە لە سوڤیەتدا هەبوو، هەماهەنگ دەکرێت؟ ئایا ئەنجامی بڕیارەکان لەگەڵ بەرژەوەندی کەرتی تایبەت لە کۆمەڵگا دیموکراتیکە سەرمایەدارییەکانی ڕۆژئاوا ناکۆك نییە؟ ئەگەر بێتو هەر یەك لە بەشدار بوان لە بڕیارداندا هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجە کورت خایەنەکانی بەش یاخود وەزارەتەکانیان بدەن، لەم کاتەدا پاراستنی ((بەرژەوەندی گشتی)) و ئامانجە ستراتیژییەکانی درێژخایەنی نەتەوەیی چی بە سەردا دێت؟ هەڵبەت بە بۆچوونی ((لیند بلوم)) ئەگەرچی هەر یەك لە بەشدار بوان ڕوانگەیەکی تایبەتیان هەیە بەڵام ئەنجامی دانوساندنەکان بە جۆرێکە کە تیایدا بەها گشتییەکان ڕۆڵی باڵا دەست دەگێڕن. لیند بلوم و وایلد واسکی بۆ ئەوەی کە بە پێی ڕۆڵ، حەز، ستراتیژی و لێکدانەوە جۆراوجۆرەکان بە زنجیرە بڕیارێکی هەماهەنگ بگەن، لەگەڵ ئابوورناسە کلاسیکییەکان هاودەنگن و بۆ خستنە رووی تیۆرییەکانیان پشت بە ((دەستی شاراوەی)) ئادام سمیس دەبەستن. پسپۆرانی پلان دانان و سیاسەتمەداران لە



دیموکراسییەکانی ڕۆژئاوادا لە رووی تیۆرییەوە، هاووڵاتیان سەرەڕای بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکاندا، بەرنامە و سیاسەتی پارتە جۆراوجۆرەکان پەسەند یان ڕەتدەکەنەوە بێگومان خەڵك بە گشت بەرنامەکان دەنگ نادەن بەڵکو هەڵبژاردنەکانیان (خیارات) پشت بەستراوە بە کۆمەڵێك سیاسەت و بەها هەڵبەت زۆر جار جیاوازی لە نێوان بەرنامەی پارتە سیاسییەکان بە ئەندازەیەك لێك نزیك و جیا نەکراوەن کە بە دەنگدەر دەرفەتی هەڵبژاردنی راستەقینە نادات. لە لایەکیترەوە سەرەڕای گۆڕینی حکوومەت، سیستەمی کارگێڕی لە رووی تایبەتمەندییە بۆرۆکراسییەکانەوە بەرپەرچی گۆڕینی بەرنامەکان دەدات و خوازیاری پاراستنی بەرنامە بەراییەکانە. پەرلەمان بە هۆی کەمی پسپۆڕ و نەبوونی دەرفەتی پێویست توانایی دەربڕینی بۆچوونێکی قایم بۆ ئالۆزی پلان دانان و بودجە دارشتن نییە، هەر بۆیەش زۆر جار بڕیارەکانی دابەشکردنی (توزیعی) دەسەڵاتی جێبەجێ کردن وەك خۆی لە لایەن پەرلەمانەوە پەسەند دەکرێت و تەنانەت ڕۆڵی ئەم دامەزراوەیە تا ئاست ((داشێکی لاستیکی)) دادەبەزێنێت لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا زۆرتر لە نێوەی بەرنامە و پلانەکانی کە پێشنیاری کۆنگرێس دەکرێت، لە لایەن بەشەکانی وەزارەتەکان، گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکانی سیاسی و ئابوورییەوە پێشکەش دەکرێت نەك لە لایەن هەڵبژاردەر و دەنگدەرەکانەوە، بەم جۆرەش لە پراکتیکدا سیستەمی یاسادانان ڕۆڵێکی کەمی لە سیاسەت دارشتندا هەیە و زۆر جار دەبێت بە ئامرازێك بۆ ڕەخنەگرتن لەو پێشنیارانەی کە لە لایەن دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکانەوە پێشکەش دەکرێن.

بەڵگەنەویستە، سیستەمە دیموکراسییەکانی ڕۆژئاوا بەو چەشنەی کە لە تیۆردا هاتووە کار ناکات، بەو واتایەی کە بۆ نموونە لە بەریتانیا سەرەڕای ئەوەی کە سیاسەتمەداران کە لە ترۆپکی وەزارەتەکاندان لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردراون، بەڵام لە دەرکردنی بڕیارە دابەشکردنەکاندا ڕۆڵی کەمیان هەیە و لە پراکتیکدا پسپۆڕە ناهەڵبژاردراوەکان لە لایەن خەڵکەوەن کە بڕیارە بەراییەکان دەردەکەن. هەڵبەت





ناتوانن لە گشت بابەتەکاندا وەها چاوەڕوان بکرێت کە سیاسەتمەداران وەك کویلە پەیڕەوی لە پسپۆڕان بکەن. هەندێ جاریش وەها هەڵهێنان دەکرێت کە ئەگەر بێتو پسپۆڕان بڕیاری وەزیرەکان جێبەجێ بکەن، هەلومەرج باشتر دەبوو. بە هەر حاڵ نابێت وەها وێنا بکرێت کە گشت کاتێك سەرکردە سیاسییەکان لە ئابوورێکی بەرنامە بۆ دارێژراوی ڕۆژئاوادا ڕێگە بە پسپۆڕەکان بدەن تا بەپێی دوایین تیۆرەکانی ئابووری، سەربەخۆیانە بڕیارگەلێك دەربکەن بە بەخشینی پێگەیەکی تایبەتی سیاسی بە پلان دانەران. لەوانەیە نوێی پێکهاتووە لە کنوکراتەکان سەر هەڵ بدات پێویستە ئاماژە بکرێت کە بوونی دەسەڵاتێکی بێ پاساو لە دەست پلان دانەراندا، ناکۆکیگەلێك لە بەها دیموکراتیکەکانی سەرمایەداریدا دروستدەکات کە بێ بایەخ کردنی هەڵبژاردنەکان و مافی دەنگدانی لێدەکەوێتەوە. زۆر جار پلان دانەران مودیلێك دروستدەکەن، بە چەشنێك کە هەندێ جار زۆر سەختە پرسە قووڵە ئابوورییەکان لەگەڵ سیاسەتمەداراندا باسبکەن و شیبکەنەوە. ئەم چەمکانەی کە پلان دانەران لەگەڵیاندا کاردەکەن و ئەو تەکنیك و زمانەی کە بەکاری دێنن، بۆ سیاسەتمەداران ناروونن و تێگەیشتن لەم چەمکانە سەخت نەبوونی زمانێکی هاوبەش لە نێوان سیاسەتمەدار و پسپۆڕانی پلان دارشتندا کاتێك زەق دەبێتەوە کە سیاسەتمەداران جەخت لە سەر پرسە گرنگە سیاسییەکان دەکەنەوە، بەڵام پلان دانەران مودیلە جۆراوجۆرە ئابوورییەکان ڕەچاو دەکەن. بەم جۆرەش سیاسەتمەداران ناچارن بەڵگاندن و ئەنجامگیری ئەو پلان دانەرانەی کە راستەوخۆ رۆڵی کاربەدەستە هەڵبژاردراوەکان لە لایەن خەڵکەوە دەگێڕن، پەسەند بکەن. هاوتەریب لەگەڵ ئاڵۆزتر بوونی تەکنۆلۆژیای پلان دانان، لێهاتوویی شیکردنەوە، دەسەڵاتی سیاسی لە سیاسەتمەداران بۆ تکنیسیەنەکانەوە دەگوزرێتەوە. لەم رەوتەدا دەبینین کە بوونی پسپۆڕانی پلان دانان کە هیچ جۆرە بەرپرسیارێتییەکی سیاسییان نییە و لە دەرەوەی کونترۆڵی سیاسەتمەدار و خەڵکدان، بابەتی پلان دانان و دەرکردنی بڕیارە دابەشکردنەکانی لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا ئاڵۆزتر کردووە.



لە بەریتانیا لە نێوان ساڵانی ١٩٥١-١٩٦٤ دا، پارێزگاران ڕووبەڕووی خواست پروفشناڵە ئابوورییەکان بێ ناو و نیشان بن. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە سەرەڕای بەدەست گرتنی پۆستە هەستیار و گرنگەکان لە بڕیارە بەهایی و سیاسییەکاندا، لە جێبەجێ کردنی بڕیارە دابەشکردنەکانیشدا دەسترۆییان هەبێت بەم جۆرەش ئەوان هەوڵی بەدەست هێنانی پێگە و پۆستی نوێی بۆ دامەزراندنی پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ وەزیرەکانیان دەدا. دوای بەدەسەڵات گەیشتنی پارتی کرێکاران لە ساڵی ١٩٦٤دا، حکوومەتی نوێ هەوڵیدا کە بۆ چارەسەرکردنی ئەم تەنگ و چەڵەمەیە دوو شێواز بەکار بهێنێت، یەکەم: سپاردنی پۆستە گرنگەکان بە ئابووری ناسان بوو کە بەم جۆرەش ئەوان بەهێزتر دەکران و دوخێك دەهاتەکایەوە کە لەمیانەیدا راستەوخۆ لەگەڵ سەرکردە سیاسییەکان پەیوەندییان دەبوو. دووەم: دامەزراندنی ((بەشی کاروباری ئابووریی)) بوو کە بەم جۆرەش دوخێك دەهاتەکایەوە کە ئەوان راستەوخۆ و بە بێ چاودێری کردن و دەستێوەردانی لە لایەن خەزینەوە ڕۆڵی گرنگیان لە بڕیارەکانی دابەشکردن و پلان داناندا دەگێڕا، لە بەریتانیا یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی دژایەتیکردنی پلان دانان، خەزینە بووە. پسپۆڕە پروفشناڵەکانی ئەم دەزگایە دەسەڵاتێکی بێ وێنەیان هەیە. ئەم دەزگایە ڕۆڵێکی کاریگەر لە دیارکردنی باج و دابەشکردنی بودجە دەگێڕێت و کاربەدەستانی خەزینە دەتوانن لە کاتی پێویستدا، لە سەر هەر یەك لە وەزارەتەکان بۆ کەم کردنەوە یاخود زیاد کردنی تێچوونەکان کاریگەری بنوێنن. هەڵسوکەوتی پلان دانەران لەگەڵ ئەم ناوەندەی دەسەڵات و پرسیارگەلێك کە سەبارەت بە ئاسەوارە ئابورییەکانی باج و ناکۆکی لە نێوان پلان و ستراتیژییە درێژ خایەنەکان لەگەڵ بڕیارە تەکنیکییەکانی دابەشکردن، دەخەنەڕوو، ئەم دەزگایە ڕووبەڕووی هەڕەشەی جیددی دەکاتەوە. لەم رەوتەدا، پلان دانەران سەبارەت بە پەیوەندی نێوان پرۆژە حەیەوییەکان و ستراتیژی گشتی کە لەوانەیە بەهێزبوون یاخود کەم بوونەوەی چاودێری دارایی لێ بکەوێتەوە، زۆرتر لە پرسە تەکنیکییەکان بەرپەرچدانەوەیان هەیە.





لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ئەو ئابووری ناسانەی کە لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی بودجە و ئەنجوومەنی راوێژکارانی ئابووری کاردەکەن، دەتوانن لە رێکخستنی سیاسەتی دارایی سەرۆك کۆمار و راسپاردە و پێشنیارەکانی بەکۆنگرێس لە بوارەکانی پێودانگەکانی باج و تێچوونەکان کاریگەرییان هەبێت، دامەزراندنی هێلی پەیوەندی لە نێوان راوێژکارانی ئابووری و سەرۆك کۆماردا دەبێتە هۆی ئەوەی کە راوێژکاران دەسەڵاتێکی زۆر لە پرۆسەی سیاسیدا بەدەست بهێنن.

بە هەر حاڵ، هەر چەند سیاسەتمەداران لە رووی ئاکادیمیکی و ئەزموونی پراکتیکی، زانیاری زۆرتریان سەبارەت بە پلان دانان و بودجە دارِشتندا هەبێت کەمتر دەکەونە ژێر کاریگەری پسپۆرەکاندا. بۆ خۆ دوورخستنەوە لەم بارودۆخە، پێویستە خودی سیاسەتمەداران بن بە پلان دانەری راستەقینە، ئەزموونی پلان دانان لە کۆمەڵگا دیموکراتیکەکانی رۆژئاوادا نیشاندەری ئەوەیە کە سیاسەتمەداران رۆڵی ئەوتۆیان لە پرۆسەی پلان داناندا نەبووە و ئەم رۆڵە بە پسپۆڕانی پلان دانان دەسپێرن و پسپۆڕانیش هەندێ کار ئەنجامدەدەن کە لە راستیدا بەشێکن لە ئەرکی سیاسەتمەداران، بە چەشنێك کە ناوەڕۆکی پلانەکان زۆرتر رەنگدەرەوەی بۆچوون و روانگەی پسپۆرەکانە، نەك دەربڕی هەڵبژاردنە سیاسییەکان بۆ ئەوەی کە بتوانین بەشداربوونی سیاسەتمەداران لە پەیوەندی نێوان فاکتەرەکانی گەشەسەندن و فاکتەرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتیش پەیوەندی نێوان ئامانجە سیاسییەکان و پلانە سیاسییەکان تێبگەین. دووەم: پێویستە سیاسەتمەداران لە تیۆرە باوەکانی پلان دانان لە شێوە گشتی و لۆژیکییەکەیدا ئاگاداربن، بەبێ چوونە ناو وردەکارییەکانەوە. سێیەم: پەیوەندییەکی ئەقڵانی لە نێوان پرۆسەی پلان دانان و پرۆسەی بڕیاردەرکردنە سیاسییەکاندا دامەزرێت، بە چەشنێك کە لە رێڕەوی پلان داناندا روانگە و بۆچوونە سیاسییەکان فۆرمۆلە بکرێن.

بۆ دامەزراندنی هەماهەنگی لە نێوان دامەزراوە جۆراوجۆرەکاندا کە لە دابەشکردن و تەرخانکردنی سەرچاوەکاندا بەشدارن. پێویستە دەزگای پلان دانان لە



سەنتەری مائیسنی حکوومەتدا بێت تا پلان دانەران بتوانن رێنمایی پێویست بۆ دارِشتنی ستراتیژییەکی درێژ خایەن پێشکەشی حکوومەت بکەن. هەڵبەت بە بۆچوونی هەندێ لە پسپۆڕان ئاستەمە ئەو پلان دانەرانەی کە دەسەڵات و پرستیژێکی زۆریان هەیە دەرفەت بە سیاسەتمەدار و بەڕێوەبەرە ئاساییەکان بدەن کە بتوانن بە کەسانی وەك سەرۆك وەزیران، وەزیری خەزێنە و وەزیرە پەیوەندیدارەوە، پەیوەندی بکەن لەوانەیە سەبارەت بەم بابەتە ئەزموونی پارتی کرێکارانی بەریتانیا لە دامەزراندنی ((بەشی کاروباری ئابووری)) سەرنج راکێش بێت کە هەڵبەت هەندێ کەس دامەزراندنی ئەم پارتە بە یەکێك لە هەڵەکانی ئەم حکوومەتە لە چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ پرسە بۆرۆکراتیکییەکان دەزانن.

### پۆلۆرایزم و پلان دانان:

ئەمڕۆکە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکانی رۆژئاوا، بە تایبەتیش بەریتانیا و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وەك رابردوو بە دیموکراسی لیبراڵ هەژمار ناکرێن، چونکە ئەمڕۆکە لەم وڵاتانەدا حکوومەت نەتەنیا لەگەڵ پارتە سیاسییە بەرهەڵستکارەکان و دەنگدەران هەڵسوکەوت دەکات. بەڵکو پێویستە بتوانن وەڵامدەرەوەی خواست و گرووپە بەهێزەکانی وەك یەکێتی کرێکاران، کۆمپانیا بازرگانی و داراییەکان و گرووپی گوشار بن. ئەم دۆخە نوێیە کە بە ((دیموکراسی پۆلۆرالیزمی)) ناونراوە، زۆرێك لە تاك، گرووپ و دامەزراوەکان بەپێی حەز و بەرژەوەندییەکانیانەوە دەخاتە ناو پرۆسەی سیاسیدا. لەم چەشنە بارودۆخەدا حکوومەتەکان رۆڵی ناوبژیوان لە نێوان داواکارییە جیاواز و دژ بە یەکەکان دەگێڕن. لە توێژینەوەیەکدا کە لە لایەن پرۆفیسۆر (ئانتون)ەوە سەبارەت بە دەرکردنی بڕیارە دابەشکردنەکان لە ولایەتی ئیلی نویزی ئەمریکادا ئەنجامدراوە، بەو ئەنجامە دەگات کە ئەگەرچی لە رواڵەتدا قایمەقایمی ئەو ولایەتە بەهێزترین ئەکتەری گۆرەپانە، بەڵام دەسەڵاتەکەی لە ژێر گوشاری گرووپە جۆراوجۆرەکانەوە سنووردار دەکرێت. بە پێی ئەم توێژینەوەیە، لە هیچ یەك لە ساڵانی





١٩٦١و١٩٦٣، قایمەقامی ئەم ولایەتە لە پرۆسەی بودجە دارِشتندا رۆڵی کارای نەبووە و تەنیا ئەو بڕیارانە کە پێشتر لە لایەن گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکانەوە دەردەکران، رەزامەندی نیشاندەدا.

لە سیستەمی پۆرالیزمدا کە جۆرە دابەشکردن و پەرت و بلاوی دەسەلات لە بەشە جۆراوجۆرەکانی سیستەمدا هەیە و هەر بەشێك هەوڵدەدات، ئامادەگی چالاکانەی خۆی لە پرۆسەی دەرکردنی بڕیارە دابەشکردنەکاندا رابگەینێت، پلان دانانی ئابووری رووبەڕووی گرفتگەلی فراوانە، چونکە پلان دانان پێویستی بە ناوەندگەراییە و ناوەندگەراییش لەگەڵ رۆحی پۆلۆرایزمدا ناسازگارە. لە سیستەمە پۆلۆرالیزمییەکانی رۆژئاوادا، چ فیدراڵ چ سادە، کە تیایدا دەسەلات نێوان دەسەلاتی جێبەجێ کردن، یاسادانان، حکومەتی فیدراڵ، ولایات و حکومەتە خۆجێییەکان، گرووپەکانی بەرژەوەندی، گوشار، کەرتی حکومەتی تایبەت بە رێژەی جیاواز دابەشکراوە، ئەم ناوەندگەراییە گرفتگەلی فراوان دەخوڵقێنێت، چونکە ئەو هەوڵانەی کە لە ژێر گوشارەکانی سەرەوە ئەنجامدەدرێن، ناتوانێت سەرکەوتنی ئەوتۆ مسۆگەر بکات، هەڵبەت هەندێ کەس لەو بڕوایەدان کە دەکرێ پلان دانان بەبێ ناوەندگەراییەوە ئەنجامبدرێت. ((بورکهد)) لە توێژینەوەکانیدا نیشانیداوە کە ((هەنۆکە گشت ولاتانی ئەوروپا چ رۆژئاوایی و چ رۆژهەلاتی چوونەتە ناو قۆناغی ناناوەندگەرایی لە پلان دانانی ئابووریدا)).

لە سیستەمێکی وەکو ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کە بە پێی دابەشکردنی یاسایی و سیاسی ئەرکەکانی حکومەت دیارکراوە هەر لایەنێك سەربەخۆیانە بڕیارە دابەشکردنەکان دەردەکات. بە واتایەکیتر، جۆرە دابەشکردنێکی کار و ئەرکەکان سەبارەت بە پلان دانان لە نێوان حکومەتی فیدراڵ، ولایات و خۆجێییەکان دەبینرێت، بە چەشنێك کە هەر لایەنێك خاوەنی رێژەیەك لە سەربەخۆیی کارکردن و دەسەلاتی دارایی بۆجێبەجێ کردنی ئەرکەکانی هەیە. ئاماژەدان بەو خاڵە پێویستە، کە سەبارەت بە ناناوەندگەرایی دەسەلاتی دارایی و پێشکەشکردنی



خزمەتگوزاری حکوومی، دابەشکردنی ئەرك و سەلاحیاتی سیاسی ولایەتەکان و حکوومەتە خوجێییەکان بە پێی یاسا ئابوورییەکانەوە دیار نەکراوە.

بێگومان لە ژینگەیەکدا کە دەسەلات تیایدا دابەشکراوە، رۆڵی دابەشکردن (توزیع) نافەرمییە و کارکردو ئەرکەکان بە ناروونی پێناسە دەکرێن تا رادەیەك کە هەر یەك لە ئەکتەرەکان و بڕیاردەران هەوڵی پێویست بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و ئازادانە کارکردن دەدەن و هەوڵدەدەن کە دەربڕی بەرژەوەندی و داواکارییەکانی خۆیان بن. بۆیە ئەمڕۆکە بە بۆچوونی زۆرێك لە لێکۆڵەرەوان لە دیموکراسییەکانی رۆژئاوادا ئەولەوییەتەکانی بەکاربەران رەچاو ناکرێت و ئەمەش گرفتگەلی زۆر لە پرۆسەی پلان داناندا دروستدەکات. بە بۆچوونی هەندێ کەسیتریش پێویستە بڕیارەکانی تایبەت بە دابەشکردنی سەرچاوەکان بەپێی لێکدانەوەی ورد و بەراورد کردنی تێچوون و داهاتەکان ئەنجامبدرێت، بەلام گرووپێکیتر لەو بڕوایەدان کە پێویستە بڕیارەکانی تایبەت بە بودجە و پلان دانان بە پرۆسەیەکی سیاسی هەژمار بکرێن. بۆیە ئەگەر بمانەوێت کە ئەم پرۆسەیە بە دیموکراتیك و جەماوەرییانە بمێنێتەوە، پێویستە سەبارەت بەو کەسانەی کە هەڵدەبژێردرێن دەرفەتی پێویستیان بۆ خستنەڕووی داواکاری و خواستەکانیان هەبێت.

بە گشتی دەبێ ئاماژە بەو خاڵە گرنگە بدرێت کە دەزگاکانی پلان دانان ناتوانن بۆ وەلامدانەوەی داواکاری هاوولاتیان لە پشت دەرگا داخراوەکاندا بڕیار بدەن، تەنیا کاتێك نەبێت کە ئەم دەزگایانە لەگەڵ گشت دامەزراوەکانی دابەشکردنی سەرچاوەکان پەیوەندییان هەبێت. پێویستە لە بیر نەکرێت کە دامەزراندنی ئەم پەیوەندییە لە نێوان سیستەمی پلان دانان و بودجە دارِشتندا پرسگەلی زۆر ئالۆزی بۆ کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکانی رۆژئاوا خولقاندووە، بە چەشنێك کە پێکەوە ژیانی بڕیارەکانی بودجە و شێوازەکانی پلان دانان رێژەی ناکۆکی و بارگرژی نێوان کەرتە جۆراوجۆرەکانی زۆر کردووە. بە هەر حاڵ ستراکتۆرەکانی کۆمەڵگاکانی رۆژئاوا ناتوانن لە شێوازە نادیموکراتیکەکان کە لە لایەن پلان دانەر و بودجە دارێژەرانەوە (و





ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەری لە سەر ئەم دوو گرووپە دەنوێنن) لە یەك کاتدا پەیڕەوی دەکرێت، خۆیان دوور خەنەوە. پرسیاری سەرەکی کە لێرەدا گەڵاڵە دەکرێت ئەوەیە کە ئایا بە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی و حەزە دژ بە یەکەکان و ناکۆکیگەلی جۆراوجۆری سیاسی و ئابووری کە لە کۆمەڵگا پۆلۆرایزمە دیموکراتیکەکانی رۆژئاوادا هەن، پلان دانەران دەتوانن وەڵامدەرەوەی داواکارییە لۆژیکییەکانی هاووڵاتیان بن و ((بەرژەوەندی گشتی)) دابینبکەن؟



# بەشی هەشتەم

# چاکسازی و شۆڕش

لە بابەتی چاکسازی و شۆڕش و شێوازەکانیتری وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی، زۆربەی لێکۆڵەران جەختیان لە سەر گرنگی بەها کۆمەڵایەتییەکان (سیمبولەکان) وەك ئامرازێك بۆ پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتی ستراکتۆرێکی کۆمەڵایەتی دیارکراو، هەروەهاش وەك فاکتەرە سەرەکییەکانی وەرچەخان، کردووەتەوە. بۆیەش پێویستە بۆ هەر شیکردنەوەیەکی چاکسازی شۆڕش، پێش هەڵسەنگاندنی ئەم دوو جۆرە لە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی [واتە چاکسازی و شۆڕش] ئەو مکانیزمانەی کە لە ڕێگەیانەوە ئەم بەهایانە لە سەر کردەی کۆمەڵایەتی کاریگەری دەنوێنن، دەست نیشان بکەین.

یەکەمین خاڵ کە پێویستە ڕەچاو بکرێت ئەوەیە کە بەهاکان فاکتەرگەلێك نین پێکەوە گرێدراو نەبن و لە بۆشاییدا بوونیان هەبێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ دیارکەری ڕەفتاری مرۆڤ و ڕوانگەکانی بۆ جیهانە و بە شێوەیەکی ئاڵۆز پەیوەندی دوو لایەنەیان پێکەوە هەیە. هەر بۆیەش لە وانەیە باشتر بێت کە باس لە ((سیستەمی بەهاییەکان)) بکەین لە بری بەها تاکەکان (منفرد).

سیستەمی بەهاکان نەتەنیا لە دەوروبەری ڕۆڵ و دامەزراوەکانی گشت کۆمەڵگادا بوونیان هەیە، بەڵکو لە دەوروبەری تاکەکانیشدا هەموو تاکەکان لە پرۆسەی کۆمەڵایەتی بووندا، ئەم بەهایانە دەروونی دەکەن [واتە لە دەروونی تاکدا جێگر دەبن]. ئەم بەهایانە، پاڵنەرگەێك بۆ ڕەفتارکردن لە تاکدا دروستدەکەن کە دیارکەری چاوەڕوانی ئەوانیترە و چوارچێوەیەکی گەڕانەوە (مرجع) بۆ ئەم چاوەڕوانییە دروستدەکات. هەندێ لەم سیستەمە بەهایانە تاکەکەسین و پەیوەندییان بە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و ئابووری تاکەوە هەیە، بەڵام سیستەمی بەهاکانیتریش لە کۆمەڵگادا هەن و لە لایەن خەڵکەوە پەسەند کراون و بە هۆکار و پاساو هێنانەوەی بوونی دامەزراوە، کاربەدەست و ستراکتۆرەکانی دەسەڵات هەژمار دەکرێن.

گرس و میلز (Gerth and mills) سیستەمە بەهاییەکانی جۆری دووەم کە مەشروعییەت بە ستراکتۆری دەسەڵات یاخود سیستەمێکی جێگیرکراو دەبەخشن بە

((سیمبولە باشترەکان))،((سیمبولەکانی مەشروعییەت))، ((سیمبولەکانی پاساواندن)) ناو دەبەن. ئەم بەهایانە کە ((مارکس))، ((مانهایم)) و ((لاسول)) بە ((بیرۆکەی گەلی زاڵ))، ((ئایدیۆلۆژیا)) و ((سیمبولەکانی دەسەڵات)) ناو دەبەن، تارادەیەك لە لایەن خەڵکەوە پەسەند کراون و لە دەروونیاندا جێگیر بوونە کە مرۆڤ تەنیا بە روانگەیەکی راست و دروست لە قەلەمیان نادات، بەڵکو لە رێگەیانەوە دەروانێتە بابەتەکانیتر، هەر بلێت بابەتگەلی زەینین کە پێویستە بە بابەتگەلی بەڵگە نەویست هەژمار بکرێن. لە رێگەی گرێدانی سەروەری بەم بروایانەیە کە فەرمانڕەواکانی پاساونانەوەی فەرمانڕەوایەتییان دەکەن و بەم جۆرەش هەر جۆرە دژایەتیکردنیان بە دژایەتیکردنی ئاکارەکان، رێزگرتن لە یاساو گشت ستراکتۆری بڕوایی — کۆمەڵایەتی هەژمار دەکرێت.

بەم پێیەش یەکێك لە گرنگترین کارکردەکانی سیستەمی بەها، مەشروعییەت و دەسەڵات بەخشین بە حکوومەتێکە کە بەپێی پێناسەی ((ماکس ڤێبر)) ((بانگەشەکەربێ مۆنۆپۆڵ کردنی دەسەڵاتی مەشروعە لە چوارچێوەی قەلەمڕەوێکی دیارکراودا)).

زیاد لەمەش، بەهاکان لەرێگەی دامەزراندنی بنیاتێك بۆ هاوکاری یەکترکردن تا رادەیەکی زۆر پێوستی پشت بەستن بە زۆر (قهر) کەم دەکاتەوە. چونکە ئەم هاوکارییە کاریگەرترە لە گوشار هێنان، بە واتایەکیتر بڕوای هاوبەشە.

ئەو رادەیەی کە سیمبولە باشترەکان یاخود سیستەمی بەهاکان لە لایەن خەڵکەوە بە بەڵگەنەویست هەژمار دەکرێن یاخود لە دەروونی مرۆڤدا جێگیر کراون، پەیوەندی بە جۆری ستراکتۆری کۆمەڵایەتی یاخود سیستەمی جێگیرکراوەوە هەیە. بە بڕوای گرس و میلز لێرەدا دوو حاڵەت بەدیدەکەین کە لە حاڵەتی یەکەمدا سیمبولە باشترەکان لە لایەن هیچ کەسێکەوە گومان لێناکرێن یاخود هەر گەڵاڵە ناکرێن. چونکە ئەم سیمبولانە تا رادەیەك لە هزر و هەستەکانی مرۆڤدا ئامادەگیان هەیە کە پێویستیان بەروونکردنەوە نییە و زۆریش جەخت لە سەریان ناکرێت. ئەم دەروونی



کردنە، لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگا تەقلیدییەکانی خاوەن بڕوا و دامەزراوی وێکچوو. زیاد لەمەش، سیستەمی بەهای زاڵ، لە کاتێکدا کە ئامرازەکانی پەیوەندی کردن لە دەست کەسانێکدان کە بۆ دەسەڵاتەکەیان پاساو دێننەوە، گۆمان لەم بەهایانە ناکرێت. حاڵەتی دووەم کاتێك روو دەدات کە بەها باڵا دەستەکانی هەندێ کەس رووبەرووی گومان دەبنەوە. لەم چەشنە بارودۆخەدا، مومکینە ((سیمبولگەلی دوو لایەنە)) سەر هەڵبدەن کە هێرش دەکەنە سەر دەسەڵاتی بەرقەرار و سیستەمگەلی بەهایی نوێ دەخولقێنن.

لە روانگەی گرس و میلزەوە سێ فاکتەر پێویستە بۆ رووبەڕوو بوونەوە و رکابەرێتی کردنی سیمبولەکانی مەشروعییەت:

١. جۆراوجۆری (تنوع) پێکهاتەی دامەزراوەکان.
٢. وەرچەرخانی خێرایی دامەزراوەکان.
٣. بە ئاسانی دەست گەیشتنی کەسانی خاوەن بیروڕای جیاواز بە ئامرازەکانی پەیوەندیکردن.

ئەم فاکتەرانە دەبنە هۆی دژ یەك بوونی رۆڵەکان و خولقاندنی بەهاگەلی جیاواز کە ئەمەش نەبوونی ئیعتبار دروستدەکات. بە بۆچوونی زۆرێك لە بیردۆزان، نەبوونی ئیعتبار مەرجی سەرەکی وەرچەرخانە ئەویش لە رێگەی شۆڕش یان چاکسازییەوە.

شۆڕش و چاکسازی وەرچەرخانگەلی هۆشیارانە لە ستراکتۆری کۆمەڵایەتی یاخود هەندێ کەرتی کۆمەڵایەتی و وەرچەرخان لە ئاستی ئایدیۆلۆژیکیدا لەخۆدەگرێت. بەڵام پێش خوێندنەوەی گشت جۆرەکانی ئەو وەرچەرخانانەی کە ئەم چەمکانە لەخۆدەگرێت، باشتر خوێندنەوەی هۆیەکانی حەزی خەڵك بەم وەرچەرخانانە بزانین.

هەندێ لە زانایانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان باس لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ناهاوسەنگ دەکەن کە بەهاکانی کۆمەڵگا، لەگەڵ ئەو واقیعییەتانەی کە لە لایەن بەهاکانەوە رەچاو دەکران. چیتر هەماهەنگ نین. وەرچەرخان تەنیا لە سیستەمی کۆمەڵایەتی ناهاوسەنگدا روونادات، بەڵکو کۆمەڵگا هاوسەنگەکانیش بەردەوام





رووبەڕووی گۆڕان و وەرچەرخان دەبنەوە لەگەڵ ئەمەشدا ئەم جۆرە کۆمەڵگایە پێکەوە گونجانی نێوان ژینگە و بەهاکان دەپارێزێت، بەڵام لە کۆمەڵگای ناهاوسەنگدا کە هەلومەرجی شۆڕش تیایدا بەرجەستە دەبێت، چیتر ئەم تجانسە بوونی نییە.

زانایانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان ئاماژەیان بە چەندین هۆ بۆ نەبوونی تجانس لە کۆمەڵگادا کردووە کە بریتین لە: جیاوازیکردن (تمیز)، سەروەر نەبوونی یاسا، نەبوونی شیاوێتی [واتە کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو]، گەندەڵی، بەرزبوونەوەی لەڕادەبەدەری نرخەکان، کەم بوونەوەی توانای کڕین و بێکاری. ئەگەرچی لە قۆناغەکانی جۆراوجۆردا و لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا گشت ئەم دیاردانە لە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی و بزاڤی گشتیدا رۆڵیان هەبووە، بەڵام ئەم فاکتەرانە دەربڕی پێودانگە رێژەییەکان نین و روونکەرەوەی کاریگەری نواندن یاخود کاریگەری نەنواندنی ئەم گۆڕانکارییانە بەسەر بەهاکان و ژینگە و چۆنێتی ئەم گۆڕانکارییە نین. والاس (Wallace) فەهرەستێکیتر لەم فاکتەرانە دەخاتەڕوو کە پێکدادانی ناوخۆیی نێوان گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان لەخۆدەگرێت کە وەك فاکتەرێك، بەلانیکەمەوە زەرەرمەندییەکی زۆر بۆ گرووپێك دروستدەکات.

ئەگەرچی ئەم فەهرستە روونە بەڵام هۆی لێکترازانی بەهاکان روون ناکاتەوە. ((جەبری ئابووریی)) مارکیش گرنگی پێویست بە رۆڵی بەهاکان نادات. دۆتۆکڤیل (Togueville) لە خوێندنەوەی شۆڕشی فەڕەنسادا، تیۆری ناونراو بە ((داواکارییەکانی روو لە زیاد بوون)) هۆی شۆڕش دەزانێت دۆتۆکڤیل لەم تیۆرییەدا ئەوە دەخاتەڕوو کە لە قۆناغی بووژانەوەی هەلومەرجی ئابووریدا، لەوانەیە هەندێ گرووپ بە هۆی دابین نەبوونی داواکارییە گەورەکانیان بۆ گەیشتن بە بارودۆخێکی باشتر، بێ ئومێد بن. ئەمەش یەکێك لەو هۆکارانە بوو کە بە بڕوای دۆتۆکیل، وەرچەرخانی ریشەیی یاخود بزاڤی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە. سەرەڕای ئەمەش، تیۆرییەکیتر لە هەمبەر ئەم تیۆرەدا بوونی هەیە کە لەو بڕوایە دایە شۆڕشەکان بە هۆی نادادپەروەری لە دابەشکردنی داهاتەکاندا روودەدات. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم



تیۆرییە هیچ هۆیەك بۆ ئەم حەقیقەتە ناخاتەڕوو کە تەنانەت لە سەقامگیرترین کۆمەڵگاکانیشدا نادادپەروەری لە [دابەشکردنی] داهاتەکاندا هەیە.

لەوانەیە باشترین شێوازی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ پرسی شیکردنەوەی ئەو گوشارانەی کە دەبنە هۆی دروستکردنی بزاڤی کۆمەڵایەتی، دیارکردنی ریشەی دوو جۆری گۆڕان بێت، واتە تێکۆشانی ژینگە و شکست هێنان لە گەیشتن بە بەها ئایدیالییەکانی دیارکراو.

ریشەی گۆڕان لە ژینگەدا، نوێگەری تەکنۆڵۆژیا، سەرکەوتنی سەربازی، کۆچکردنی دانیشتوان و گەشەسەندنی ئابووری لەخۆدەگرێت. ریشەی گۆڕان لە ستراکتۆری بەهاکان، هزرە تازە سەرهەڵداوەکان، وەرچەرخان لە بیرکردنەوە و داهێنان لەخۆدەگرێت. لێرەدا دوو پرسیار سەبارەت بە چۆنێتی روونکردنەوەی ئەفراندن و چۆنێتی پەسەندکردن یاخود رەتکردنەوەی هزرێکی نوێ لە لایەن گرووپێك یان کۆمەڵگاوە دەخرێتەڕوو.

((ئەرێك ئەریکسۆن)) (Erik Erikson) دەروونناسی ئەمریکایی ((لایەنگری چاکسازی)) وەك تاکێك وێنا دەکات کە لە منداڵێدا بۆ کێشە تایبەتییەکانی (شخصی) خۆی فێری شێوازێکی تایبەت [بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەم کێشەیە] بووە. کاتێك کە تاك لە قۆناغی گەورەبووندا رووبەڕووی کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەبێتەوە، هەمان جۆرە بەرپەرچدانەوەی [قۆناغی منداڵی] ئەنجامدەدات.

ئەگەر گەندەڵییەکانی کۆمەڵایەتی کە ئەم تاکە (لایەنگری چاکسازی) بەرپەرچدانەوەی بدات و لە لایەن کۆمەڵگاشەوە بە گەندەڵی هەژمار بکرێت، ئەم کەسە دەبێت بە سەرکردە و وەرچەرخانەکی گەورەی کۆمەڵایەتی پۆزەتیڤ یاخود نگەتیڤ، ئەنجامدەدات.

لە لایەکیتر کە لایەنگرانی چاکسازی پێشگیری لێدەکەن ئەوەیە کە چاکسازی خوازان سەر بە پێگەیەکی نوێ یان دوو پاڵون کە مانایەکی ناروونی هەیە، وەها بانگەشە دەکرێت کە لەم جۆرە کەسە لە بارگرژی نێوان تاکەکان کەم بکاتەوە و





پێگەی بێ سنوورەکەی ئەم درفەتەی پێدەدات تا روانگەیەکی کراوەتری بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی هەبێت. تیۆری سێیەم سەبارەت بە بنیاتنەرانی چاکسازی ئەوەیە کە ئەوان خاوەن پێگە و ئیعتبارێکی بەرزن و بۆ سەپاندنی هزرەکانیان سوود لە دەسترۆییەکەیان وەردەگرن.

توانایی ئەفراندن یەکێك لە خەسڵەتە دەروونییەکانی مرۆڤە کە هیچ کاتێك بە تەواوەتی لە کۆمەڵگادا دەرناکەوێت. بەڵام هیچ کاتێکیش بە تەواوی سەرکوت ناکرێت، سیستەمی کۆمەڵایەتییەکان لە رێگەی بەدەستهێنانی بۆچوونی ((لایەنگرانی چاکسازی)) بە مەبەستی چالاکی نواندن لە چوارچێوەی سیستەمدا و لە رێگەی بەخشینی پاداشت، کۆنترۆڵی دەسترۆیی هزرە نوێیەکان دەکەن. ئەم کارەش دەبێتە هۆی کەمتر کاریگەر بوونی ئەم کەس و رێکخراوانە لە سەر هاوڵاتیاندا. لەخۆگرتنی لایەنگرانی چاکسازی لە چوارچێوەی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا، یەکێك لە شێوازەکانە کە کۆمەڵگا و بە تایبەتیش دەسەڵاتداران بۆ پاراستنی هاوسەنگی کۆمەڵگا کە کەوتووەتە ژێر گوشارگەلی نوێدا، بە کاری دێنێت و ئەمەش شێوازێکە لەچاکسازی کردن لە چواچێوەی سیستەمدا. لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێ جار گوشار وەها لە ناکاو توندە کە رێڕەوی دامەزراوەکان و رۆژانەیی سیستەم بۆ پارێزگاری کردن لە خۆی ئیفلیج دەکات. لەم چەشنە بارودۆخەدا ئەرکی سەرکردەکانی سیستەمەکە سیاسەتگەلێك لە پێناو زیندووکردنەوەی پێکەوە گونجان و یەکپارچەیی دابڕێژن. سەرەکیترین خەسڵەتی سیستەمێك کە هاوسەنگییەکەی لە بەین چووبێت، ئەوەیە کە بەهاکان چیتر روونکردنەوەیەکی پەسەندکراو و سیمبولێك بۆ ژیان ناخەنەڕوو. ئەم دۆخەش هەم لە ئاستی تاك و هەمیش لە ئاستی دامەزراودا روودەدات. چونکە کاتێك کە دامەزراوەکان لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتیدا ناگونجێن، ئامانجەکانی تاکیش نانۆرماتیڤ و ناسازگار دێنە بەرچاو و بارگرژی دەروونی لێدەکەوێتەوە، ئەگەرچ تاك لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵایەتیدا هاوسان نییە. بەڵام پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان ئەم دووانەدا بوونی هەیە و تاك و سیستەم لە سەر یەکتردا کاریگەری دوولایەنەیان هەیە.



لە سیستەمی سەقامگیردا، کردەوە لە رێگە لادراوەکانی تاکەکان کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ چوارچێوەی پەسەندکراو کۆمەڵگا یەکتر ناگرێتەوە، وەك کردەیەکی تاوانکارانە و نائەقلانیانە هەژمار دەکرێت، ئەگەرچی ئەم کەسانە کردەکانیان بە ((شۆڕشگێڕی)) دەزانن. لەگەڵ ئەمەشدا، لە سیستەمی ناهاوسەنگدا، هەر تاکێك هەست بە رادەیەك لە بارگرژی دەکات و لەوانەیە بەرەو رەفتارێك هانی بدات کە پێش ناهاوسەنگ بوونی سیستەم، بە کردەیەکی لە رێگە لادەرانە هەژمار کرابا. هەروەها لەم جۆرە بارودۆخەدا بۆ ئەندامەکانیتری کۆمەڵگا سەختە کە رەفتاری دەربڕینی نارەزامەندی دژی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی لە رەفتاری تاك و سیستەمی کۆمەڵایەتیدا. کاتێك دەبێتە هۆی زانینی دەسەڵاتداران لە رووداوەکانی داهاتوو کە هێزە شۆڕشگێڕەکان بە تەواوی رێکخرا بن. خەسڵەتەکیتری سیستەمی ناهاوسەنگ ئەوەیە کە کۆمەڵگا حەز لە درزتێکەوتن لە چالاکی گرووپگەلێك دەکات کە هەندێ لە ئەندامانی پێشنیاریتر بۆ وەلانانی ستراکتۆری بەها کۆنەکان پەسەند دەکەن، بەم جۆرەش بەرژەوەندی ئەم گرووپانە دژی بەرژەوەندی کۆمەڵگا دەوەستێتەوە. بەهاگەلێك کە پێگە و رۆڵە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان بەهێز دەکات و سەقامگیری و واتایان پێدەبەخشێت، لە هەلومەرجی ناهاوسەنگیدا بارگرژی و نارەزایەتی زۆرتر بەرهەم دێنن. کاتێك کە ستراکتۆری بەهاکان و دابەشکردنی کار لەگەڵ یەکتردا ناگونجاو دەبن، بەرژەوەندییە شاراوەکان لە گۆڕینی ستراکتۆری بەرقەراردا (کە تایبەتە بە پێگەی خوارووەکانەوە) سەر هەڵدەدەن. کاتێك کە ناهاوسەنگی زۆرتر دەبێت. بارگرژی تاکەکان لە گشت پێگەکاندا دروستدەبێت و پاش ماوەیەك ئەو کەسانەی کە لە پێگەی خۆیان رازی نین. یەکتر دەگرنەوە و گرووپە لە رێگە لادەرەکان و بزاڤە بەرهەڵستکارەکان دادەمەزرێنن. کاتێك ئەم گرووپانە کە بەرژەوەندییە شاراوەکانیان ئاشکرا بوونە و ئایدیۆلۆژیای خۆیان هەڵدەبژێرن، بە واتایەکیتر ستراکتۆری کۆمەڵایەتی و بەها سیاسییەکانیتر پەسەند بکەن، کۆمەڵگا بە سەر دوو گرووپەوە دابەش دەبێت: گرووپی یەکەم کە حەز





له پاراستنی ستراکتۆری بەرقەرار دەکات و گرووپی دووەم کە ئامانجی گۆڕینی ستراکتۆری بەرقەرارە.

ئەم ئایدیۆلۆژییانە بە کەم کردنەوەی بارگرژی نێوان تاکەکان و خولْقاندنی ئاسۆییێك بۆ پێکەوە گونجانی بەهاکان و ژینگە، یارمەتیدەدەن لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ لە ئایدیۆلۆژییەکان هەر بە کەم و کوڕی دەمێننەوە و بە سیستەمی بەهاکانی هاوسەنگ هەژمار ناکرێن.

کاتێك کە ئایدیۆلۆژییایێك بە ئاستیك لە پێگەیشتن بگات کە ببێت بە ئایدیۆلۆژایەکی شۆڕشگێڕی کاملبوو، ئامانج، ئامراز و بەهاکان تێکەڵ بە یەکتر دەکات، بە واتایەکیتر سیستەمێك لە کارکردەکان دیاردەکات کە لە کاتی بەدیهاتنیدا دەتوانێت کولتووری بەرقەرار بە کولتووری ویستراو بگۆڕێت. ئایدیۆلۆژییەکان بە سیاسەت و چاکسازی هەژمار ناکرێن، چاکسازی بەرنامەگەلێکن لە پێناو دووبارە پێکەوە گونجاندنی سیستەم و لەو حەزەوە سەرچاوە دەگرن کە بەشگەلێك لە ستراکتۆر، کۆمەڵایەتی کۆن بیارێزرێت و لە میانەی ئەنجامدانی ئەم بەرنامەیەدا توندوتیژی بەکار نەهێنرێت. بە گشتی سیاسەتەکانی تایبەت بە چاکسازی، هەر وەك ئایدیۆلۆژییاکانی شۆڕشگێڕ، لە سیستەمێکی ناهاوسەنگدا دروستدەبن. بەڵام لە لایەن کەسانێکەوە پێشکەشدەکرێن کە حەز لە پاراستنی سیستەمی بەرقەرار دەکەن و بە هۆشیارییەوە بۆ کەم کردنەوەی کردەوەی توندوتیژی و شۆڕشگێڕییانەی گرووپە بەرهەڵستکارەکانەوە، هەوڵدەدەن.

ئەم سیاسەتانە کە لە لایەن سەرکردە سیاسییەکان یاخود لایەنگرانی چاکسازییەوە پەیڕەوی دەکرێن، بەبێ ئەوەی کە هاوسەنگی سیستەم تێکبدات یاخود دەسەڵات لە بەین ببات، کەرتگەلێك لە ستراکتۆری کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت. لە راستیدا، ئەم سیاسەتانە ستراکتۆری دەسەڵاتی بەرقەرار بەهێز دەکات. بۆ نموونە، چاکسازییەکانی ئەنجامدراو لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بووبە هۆی گۆڕینی کرێکارە ((یەخە شین))ە کان بۆ پارێزگارترین گرووپ لە کۆمەڵگای ئەمڕۆکەی



ئەمریکادا و بەم جۆرەش تا ئاستێکی بەرز روانگەی مارکس لاوازکرا کە لەو بڕوایەدا بوو کە کرێکاران لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا تاڕادەیەك لەخۆبێگانە دەبن کە دواجار دەست بە شۆڕش دەکەن.

کردە گەلێك کە سەرکردەکانی سیستەم لەکاتی کەم بوونەوەی دەسەڵات دەتوانن ئەنجامی بدەن، لە وەرچەرخانی پارێزگارانەوە تا کردەیەکی دوولایەنەی وەك کە لە دەقی نوخبەکان لە هەڵبەزین و دابەزین دایە. سەرکەوتنی وەرچەرخانی پارێزگارانە یاخود چاکسازی کردن بە دوو فاکتەرەوە بەندە: ئاشنایی نوخبەکان بەهەلومەرجی کۆمەڵایەتی و، توانایی ئەم نوخبانە لە دیارکردنی رەگەزگەلێك لە ستراکتۆری بەهاکان کە بۆ پاراستنی کولتوور پێویستە. ئەرکی نوخبەکان گونجاندنی ستراکتۆری بەهاکانە لەگەڵ ژینگە، کاتی دیارکراو، داڕشتنی یاسای گونجاوی نوێ بۆ رەفتاری پراکتیکە. ئەگەر نوخبەکان لە ئەنجامی ئەم کارەدا سەرکەوتوو بن، سیستەم دووبارە بەرەو پێکەوە گونجان هەنگاو دەنێت و شۆڕش روو نادات و لە بڕی ئەمەشدا، وەرچەرخانێکی پارێزگارانە یان چاکسازییەکی وەك ((پلان نوێ New Deal)ی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و (یاسای چاکسازی Reform Bill)ی ١٨٣٢ی بریتانیا روو دەدات. سیاسەتە ناشیاوەکانی نوخبەکان زۆرتر لە ئەنجامی جیا بوونەوەیان لە کۆمەڵگایە، نەك مەیلە دژە کۆمەڵایەتییەکەیان. مومکینە نوخبەکان بە هۆی ستراکتۆری نابکێشانی چینایەتی، گەندەڵی خێزان و گرووپی دەسەڵاتدار، کەناڵە داخراوەکانی جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی، راسپاردنی رۆڵەکان بە ئەندامانی ناشیاو، گۆشەگیر بن.

پێداگرتنی نوخبەکان کە بریتییە لە پەیڕەوەکردنی سیاسەتی داخراوەیی و خۆ دوور خستنەوە لە ئەنجامدانی چاکسازییەکان، فاکتەری سەرەکی سەرهەڵدانی شۆڕش بووە. لە نێوان ئەم دوو کردە دوو لایەنەدا ((چاکسازی هۆشیارانە)) و ((پێداگرتنی نوخبەکان))، چەند قۆناغێکی لێك جیاوازی چاکسازی و سیاسەت هەن. یەکێك لە گشتی ترین چاکسازییەکان بریتییە لە ئاسانکردنی هاتووچۆی تاکەکان لە شوێنێك بۆ شوێنێکیتر، لە ئەنجامی ئەم کردارەدا. سەرکردە راستەقینەکانی شۆڕش، بەرەو لایەنی نوخبەکان





رادەكێشرێن. ماوەیەكە ئاشكرا بووە كە وەرگرتنی ڕۆشنبیرانی لێهاتوو بۆ ناو گرووپی نوخبەكاندا، شێوازێكی دژە شۆڕشییانەی سەركەوتووە. چونكە دەبێتە هۆی لە كار خستنی گرووپێك كە لە كاتی نارەزایی دەربڕیندا دەتوانێت ئایدیۆلۆژییای شۆڕش دابڕێژێت ئەم سیاسەتەش دەبێتە هۆی گەڕانەوەی سەقامگیری سیستەمی سیاسی لە ژێر سێبەری بەها كۆنەكان، ئەگەرچی چاكسازی و وەرچەخانی كۆمەڵایەتیش لەخۆدەگرێت.

ئایدیۆلۆژییەكانی شۆڕشگێری، بۆ دژایەتیكردنی ئەم جۆرە چاكسازییانە، خوازیاری وەلاتانی تەواوی ستراكتۆری بەهاكانی كۆنن چونكە ئەم ئایدیۆلۆژییانە بەهاگەلێك بۆ داهاتوو لەخۆدەگرن، ستراكتۆری بەهاكانی كۆن و ئایدیۆلۆژییە ركابەرەكان لە ناو دەبەن. خەسڵەتەكیتری ئایدیۆلۆژییەكانی شۆڕشگێڕی ئەوەیە كە خوازیاری وەرچەرخانی خێرا بە دواخستنی ئامانجەكانی بۆ كاتێكیتر پەسەند ناكات. ئەم خێراییە و رەگەزەكانیتری ئایدیۆلۆژییای شۆڕشگێڕانە كاتێك كە لە گۆشە نیگای دژایەتیكردنی ستراكتۆرە كۆنەكان كە پێویستە لە بەین ببرێن سەیر بكرێت، یاخود كاتێك كە شۆڕش سەردەكەوێت ئەم خێراییە و كاریگەر دەبن.

شۆڕش دوو جۆری پێداویستی كە پەیوەندی پتەویان بە یەكترەوە هەیە بەڵام فاكتەری راستەوخۆی شۆڕش نین: یەكەم گوشارگەلێك هەن كە لە لایەن سیستەمی كۆمەڵایەتی ناهاوسەنگ، یاخود لە لایەن كۆمەڵگایەكەوە دروستدەبێت كە لە دۆخی گۆڕاندایە و بۆ درێژەدان بە ژیان پێویستی بە گۆڕانی زۆرتر هەیە. خەسڵەتێك كە لە نێوان گشت تایبەتمەندییەكانی سیستەمی كۆمەڵایەتی ناهاوسەنگ بەبێ ناوبژیوان یارمەتی شۆڕش دەدات كەمبوونەوەی دەسەڵاتە كەمبوونەوەی دەسەڵات، دەبێتە هۆی ئەوەی كە ئەوانی خاوەن دەسەڵاتی فەرمین، بە بەرفراوانی لە پێناو پاراستنی سیستەم هێز بە كار بێنن.

دووەمین كۆمەڵ لە فاكتەرە پێویستەكان، رەفتاری كاربەدەستانە لە هەمبەر گرفتە كۆمەڵایەتییە سەرهەڵداوەكان. ئەم كۆمەڵە توانایی كاربەدەستان لە ئەنجامدانی چاكسازیگەلی ئامانجدار لە كاتی ناهاوسەنگ بوونی سیستەم لەخۆدەگرێت. ئەگەر بێتو كاربەدەستان نەتوانن چاكسازیی ئەنجامبدەن یاخود سیاسەتێك پەیڕەو بكەن كە متمانەی



كەسانی دژ بە سیستەم بۆ دووبارە پێكەوە گونجان بپارێزێت، ئەم كارە بێ ئیعتبار بوون دروستدەكات. ئەمەش واتە بەكار هێنانی هێز لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، مەشروع هەژمار ناكرێت. دواین فاكتەری شۆڕش، دیاردەی شۆڕش لە دەروونی سوپادایە كە بە گشتی لە ناكاوەوە روودەدات. ئەم شۆڕشە چەكی نوخبە و كاربەدەستان بۆ سەپاندنی رەفتاری كۆمەڵایەتی لە دەستیان دەردێنێت، یاخود گرووپە شۆڕشگێڕەكان رازی دەكات كە توانایی و هێزی بەرپەرچدانەوەی دەسەڵاتی نوخبەكان لە دەست بگرن. ئەم ((فاكتەرانەی خێراكەر)) یاخود هۆیەكانی خێراتركردنی شۆڕش، گوشارگەلێكن كە دەتوانن لە كۆمەڵگایەكدا كە دەسەڵات تیایدا بوونی نەماوە، شۆڕش هەڵبگیرسێنن. لەگەڵ ئەمەشدا لە كۆمەڵگا كرێكارییەكاندا، ئەم گوشارانە بەبێ هەڵگیرسانی شۆڕش پووچەڵ بكرێنەوە. زیاد لەمەش، خێراكەرەكان فاكتەرێكن كە دیاركەری كاتی هەڵگیرسانی شۆڕش، سەركەوتن و سەرنەكەوتنی شۆڕشگێڕان لە سەقامگیر كردن و بەدەستهێنانی پێگەیەكی نوێ بۆ دەسەڵاتن.

هەر وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ كرد، خێراكەرەكان فاكتەرگەلێكن كە بە ئاشكرا كردنی ناتوانایی نوخبەكان لە پاراستنی قورغكردنی دەسەڵات، روودانی شۆڕش فەراهەم دەكەن. هەنۆكە دەتوانین جۆرەكانی ئەم خێراكەرانە ناو ببەین لە قۆناغی یەكەمدا، خێراكەرەكان فاكتەرگەلێكن كە راستەوخۆ لە سەر هێزی چەكداری وڵات، دیسپلین، پێكهاتەی دامەزراوە و وەفادارێتییان كاریگەری دەنوێنن. فاكتەرەكانیتر پەیوەستن بە بڕوای ئایدیۆلۆژیكانەی گرووپی بەرهەڵستكار و دەرفەت بۆ دەرەخسێنێت كە بە سەر توانایی سەربازیی نوخبەكان سەركەون و ئۆپراسیۆنی دژ بە هێزەكانی چەكدار ئەنجامبدەن. شیكردنەوەی سیاسییانەی هێزە چەكدارەكان لە هەر سیستەمێكدا، بۆ خوێندنەوەی هەر شۆڕشێك زۆر پێویستە. چونكە هەڵگیرساندنی شۆڕش لە پێناو گۆڕینی سیستەمدا توندوتیژی لەخۆدەگرێت، بۆیە پێویستە شۆڕشگێڕان بەرەنگاری كەسان و گرووپگەلێك ببنەوە كە كۆنترۆڵی دەسەڵاتی كۆمەڵگا دەكەن. هەر وەك یەكێك لە نووسەرەكان دەڵێت: ((شۆڕش كاتێك سەردەكەوێت كە بارودۆخی قورغكردنی دەسەڵات، بانگێشتی ململانێ





دەکرێت و ئەم کارەش تا رادەیەك بەردەوام دەبێت کە جارێکیتر قۆرغکردنی دەسەڵات فەراهەم ببێتەوە)).

کاتێك کە توندوتیژی شۆڕش بە کوتا دێت چی روودەدات؟ هەروەك هانا ئارنت دەڵێت: ((لە بنەڕەتدا زاراوەی شۆڕش بە مانای گەڕاندنەوە (Resyora tion) دێت کە سەرەڕای لەخۆگرتنی ماناگەلی جیاواز لە کاتی هەنوکەدا، بەڵام ئامانجی شۆڕشگێرانی سەدەی هەفدەیەم و هەژدەیەم هەژمار دەکرا)). بە واتایەکیتر، دواجار، پێویستە شۆڕش وەك هەوڵدانێك بۆ جێگیر کردنەوەی ستراکتۆری نوێ لە بڕی ئەو شتەی کە بەرەو نەمان دەڕوات، بناسرێت. لەم قۆناغەدا، رەچاوکردنی سەرەکی بزاڤ بە خستنەڕووی نۆرمگەلێك لە پێناو هێنانەدی گشت کارکردە سەرەکییەکانی سیستەم، لە وەرچەرخانی سیستەم بەرەو پاراستنی سیستەم، ئاراستە دەکرێت.

((رەوتی ئاسایی کردنەوەی کاروبارەکان))، ((بنیاتنانەوەی)) لایەنی جۆراوجۆری وەك رێکخستن و پەیوەندیکردن لەخۆدەگرێت. پەیوەندی، ئامرازێکە کە بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی و کامڵ کردنی گۆڕان بەکار دەهێنرێت، رێکخستن بریتییە لە دووبارە بنیاتنانەوەی پەیوەندییە گۆڕاوەکان لە ناو خودی گرووپی شۆڕشگێڕدا.

((هانا ئارنت)) دوو فاقێتی ئەم بارودۆخە بەم چەشنە دەردەبرێت: ((رۆحییەی شۆڕشگێڕی دوو رەگەزی هەیە کە بە بۆچوونی ئێمە ئاشتی نەکراو و تەنانەت دژ بە یەکن. کردەی دامەزراندنی حکوومەتی نوێ و دامەزراندنی شێوازەکی نوێی دەوڵەت پێویستی بە رەچاوکردنی قووڵی سەقامگیری ستراکتۆری نوێی هەیە. لە لایەکیترەوە، ئەزموونێك کە کەسانی گیرودە بەم پرسە قووڵە رووبەڕووی دەبنەوە، زانینی توانایی مرۆڤەکانە لە دەسپێکی کارەکان، هەروەها رۆحیەیەکی بەرزە کە هاوکات بە خولقاندنی دیاردەیەکی نوێ سەرهەڵدەدات. ئەم دوو رەگەزە، واتە رەچاوکردنی سەقامگیریی و رۆحیەی نوێ، لە زاراوە و هزرە سیاسییەکاندا چەمکگەلی دژ بە یەك هەژمار دەکەین. یەکێك لەم دوانە بە پارێزگاری ناوبراوە و ئەوەی تریش هەمان لیبراڵیزمی پێشرەوە)).



# بەشی نۆیەم

## لەمپەرەکانی بەردەم کۆمەڵگای مەدەنی

لە راستیدا باسکردن لە کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت. دیارکردنی پانتای دەسەڵاتی هەر یەك لەمانەیە، بەو مانایە کە تا چ رادەیەك کۆمەڵگای مەدەنی دەتوانێت پانتای تایبەت بە خۆی هەبێت و تا چ رادەیەك دەوڵەت رێز لەم پانتایە دەگرێت؟ لە راستیدا هەڵسەنگاندنی رادەی دیموکراسی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا بە پێی رادەی ئەم جۆرە پانتایە کولتووری، سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییە. لەم بارودۆخەدا پێویستە بزانین کە تاك و گرووپەکان تا چ ئاستێك دەتوانن دەنگ و داواکارییە سیاسییەکانیان لە سیاسەتی گشتیدا رەنگ بدەنەوە و تا چ رادەیەك دەتوانن سنوورێکی سیاسی بۆ بەرفراوان بوونی دەسترۆیی دەوڵەت دابرێژن.

رووبەری پانتای دەسەڵات لەم دوو بوارەدا (کۆمەڵگا و دەوڵەت) دەکرێ بە پێی گەمە بە کۆی گشتی سفر هەڵبسەنگێنرێت. چونکە هەر ئەندازە بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی هەنگاو بنێین، کۆمەڵگا گەورەتر و دەوڵەت بچووکتر دەبێتەوە و بە هەر ئەندازە بەرەو دەوڵەتی دەسەڵاتخواز هەنگاو بنێین. دەوڵەت گەورەتر و کۆمەڵگا بچووکتر دەبێتەوە.

لێرەدا مەبەست بەرامبەر یەك وەستانی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی نییە. گەشەی کۆمەڵگای مەدەنی بە مانای سەربەخۆیی کۆمەڵگای مەدەنی لە دەوڵەت نییە. بەڵگە نەویستە دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دەتوانن هاوکاری یەکتر بکەن، چونکە دەوڵەت بە فەراهەمکردنی چوارچێوەی یاسایی زەمینەی مانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی فەراهەم دەکات و دەسەڵاتی سیاسیش ناتوانێت بەبێ بوونی کۆمەڵگای مەدەنی لە درێژخایەندا بەردەوامی بە ژیانی بدات. لەم بارودۆخەدا دەوڵەت بۆ پاراستنی مەشروعییەتەکەی و بەرزکردنەوەی کارامەیی پێویستی بە کۆمەڵگای مەدەنی هەیە. پێویستە بزانین کە کۆمەڵگای مەدەنی دەتوانێت لە ژێر هەر سیستەمێکدا (لیبراڵ دەسەڵاتخواز و دیموکراتیك) سەرهەڵبدات. تەنیا سیستەمێك کە پانتا بۆ گەشەی کۆمەڵگای مەدەنی نێوان خەڵك و دەوڵەت فەراهەم ناکات تۆتالیتاریزمە. چونکە لەم سیستەمەدا دەوڵەت وەها بوارەکانی ژیانی مرۆڤ کونترۆڵ دەکات. کە پانتا بۆ گەشە و کامڵبوونی دامەزراوە مەدەنییەکان نامێنێتەوە.

بەم جۆرەش نالۆژیکی نییە کە کۆمەڵگای مەدەنی بە گشت تایبەتمەندییەکانیەوە لە دەوڵەت جیابکەینەوە. بەرچاوکردنی ئەم پێشەکییە، پێویستە بۆ زانینی خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێناسەی ئەم کۆمەڵگایە بکەین: بەم جۆرەش کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لە: پانتایەك لە دامەزراوەکانی سەربەخۆ، ژێر پشتگیریی یاسا، کە تیایدا تاکەکان و ئەنجوومەنەکان بەها و باوەڕگەلی جۆراوجۆریان هەیە، گرووپگەلی خۆ بەڕێوەبەر هەن کە لە پێکەوە ژیانی ئاشتیانەدان و وەك دامەزراوگەلی ناوبژیوان و خۆبەخش لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا کار دەکەن.

بەپێی ئەم پێناسەیە پێداویستی سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لە: زۆری و جۆراوجۆری ئەکتەرەکان، رکابەرێتی گرووپی، بەشداری بەرفراوانی سیاسی، سەرچاوگەی جۆراوجۆری دەسەڵات، سەربەخۆیی کارکردن و هەڵسوڕانی نوخبەکان. بەم جۆرەش کۆمەڵگای مەدەنی دەرفەت بۆ گرووپە جۆراوجۆرەکان دەڕەخسێنێت تا سەرچاوە سیاسییەکان لە پێناو دابینکردنی بەرژەوەندی و بەها تایبەتییەکان مۆبیلزە بکەن. بوونی ئەم جۆرە دامودەزگایانە دەبێتە هۆی سنووردارکردنی، کۆنترۆڵ و دەسەڵات و جۆرە باسکردن، مشتومڕ، رازی کردن و سازش لە نێوان ناوەندە جۆراوجۆرەکانی دەسەڵاتدا بەرقەرار دەبێت.

لە پرۆسەی دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنیدا، لە رێگەی دەنگەکانیانەوە لەسەر سیاسەتی گشتی کە لەلایەن کاربەدەستانی سیاسییەوە دادەڕێژرێن (لە میانەی دامەزراوە فەرمی و نا فەرمییەکانەوە) کاریگەری دەنوێنن و زۆر جار دەتوانن داواکارییەکانیان بۆ سیاسەت بگۆڕن بەم جۆرەش دامەزراوەگەلی وەك ئەنجوومەنەکانی یاسادانان، پارتە سیاسییەکان، ئەنجوومەنی خوجێیەکان و سەندیکاکان کە هەموو جۆرە رێکخراوە خاوەن بەرژەوەندییەکان لەخۆدەگرن، خەڵك بە سەرکردەکان گرێدەدەن، بەرزبوونەوەی پەیوەندیگەلی ستراکتۆریی (ناوخۆیی و نێودەوڵەتی) کە بە هۆی شۆڕشی پەیوەندییەکان لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا سەری هەڵداوە، سنوورە نەتەوەییەکانی تێکشکاندەوە و سەرەڕای کەمکردنەوەی بەردەوامی دەسەڵاتی



دەوڵەتان، ژمارەی ئەکتەرە ناحکوومییەکانی زۆر کردووە تا رادەیەك کە لە زۆر بابەتدا پێویستە دەوڵەت دەسەڵاتەکەی لەگەڵ هەندێ لە دامەزراوە ناحکوومییەکان دابەشبکات. کۆی ئەم گۆڕانانە زەمینەی کرانەوەی سیستەم فەراهەم دەکات و قەبارەی ئاڵوگۆڕی نێوان سیستەمی سیاسی و ژینگەی ناوخۆیی، هەروەها لە نێوان کۆمەڵگای ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەوە زیاد دەکات.

پەرەسەندنی ئەم رەوتە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵك بە ((هاوولاتی)) نەك ((رەعییەت)) هەژمار بکرێت. ئەم بارودۆخە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەر وەك رابردوو بێ رێزگرتن و بێ متمانەی کە وەك ئازادیی باڵا، بێکاری بە ناوی بەشداریی سیاسییەوە، پێشگیریی کردن لە گەشەی هزرە سەربەخۆکان و رەعییەتی راستەقینە بە هاوولاتی راستەقینە هەژمار نەکرێت. کرانەوەی سیستەمی هۆکارێکە بۆ ئەوەی کە هەر یەك لەم چەمکانە پێگەی راستەقینەیان بەدەستبهێنن بە گشتی وەرچەرخانە گەورەکانی بواری پەیوەندیکردن بووبە هۆی هاتنە ناوەوەی گرووپێکی گەورەی ((بێ دەسەڵاتەکان)) بۆ ناو پرۆسەی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی، تا سەرەڕای چاودێری کردنی دەسەڵاتی دەوڵەتان لە هەمبەر داواکارییە پەرت و بڵاوەکانی کۆمەڵگا، هەستیارتر و وەڵامدەرەوە بکات. سروشتییە کە بەپێی تایبەتمەندییە ستراکتۆریی و کولتووره سیاسییەکانی زاڵ بە سەر کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا، رادەی گونجانی سیستەمە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ هەلومەرجە گۆڕدراوەکانی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی جیاواز بێت و بەرپەرچدانەوەیان بۆ هەر یەك لەم وەرچەرخانانە شێوازی جیا لەخۆبگرێت. بەپێی زانیارییەکانمان لە سەر کۆمەڵگای مەدەنی، هەنۆکە پێویستە ئاماژە بە گرنگترین فاکتەرەکانی لەمپەر نانەوەی بەردەم هاتنەدی کۆمەڵگای مەدەنی بکەین. لەم وتارەدا لەمپەرەکانی بەردەم هاتنەدی کۆمەڵگای مەدەنی بەسەر پێنج گرووپ دابەشکراوەکە خوێندنەوەی هەر یەك لەم فاکتەرانەی دەکەین.





## ١. نافرەیی ستراکتۆریی و نەبوونی سەربەخۆیی ڕێژەیی سیستەمە لاوەکییەکان (SUB- SYSTBM)

دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە سروشتی و خۆرسکانە و بەپێی پێداویستییەکانی ستراکتۆریی و لە ڕێڕەوی وەرچەرخانە ئابووری، سیاسی و کولتوورییەکانەوە سەرهەڵدەدەن بەم جۆرەش بنیاتنانی دامەزراوەگەلی وەك پارتە سیاسییەکان، یەکێتییەکان، سەندیکاکان و ئەنجوومەنە خۆجێییەکان بۆ روونکردنەوەی گردبوونی خواست و داواکارییە جۆراوجۆرەکانەوە سەرهەڵدەدەن تا لە پرۆسەی گۆڕینی ئەم داواکارییانە بۆ سیاسەت کاریگەر بن. بۆیە بۆ هاتنەدی کۆمەڵگای مەدەنی، ئەم دامەزراوانە لە خوارەوە بەرەو سەرەوە سەرهەڵدەدەن و جۆراوجۆر بوونیشیان پەیوەستە بە پێداویستییە راستەقینەکانی سیاسی، ئابووری و کولتووری. ئەم جۆرە دامەزراوانە لە لایەکەوە بە خەڵك و لە لایەکیترەوە بە سیاسەتی گشتییەوە پەیوەندن بەم جۆرەش هەر جۆرە هەوڵدانێك بۆ لە ناوبردنی ئەم کەناڵانە، دەبێتە هۆی لەمپەرنانەوە لە بەردەم پێگەیشتنی کۆمەڵگای مەدەنی و دەسەڵات بەخشینی زۆرتر بە دەوڵەت. پەیوەندییە بەردەوامەکانی نێوان دامەزراوە مەدەنییەکان بە هۆی شۆڕش، زۆر بوونی داواکارییەکان پەیوەندیگەلی زۆر ئالۆز دروستدەکات. بە چەشنێك کە ناکرێ لە ڕێگای دەرکردنی یاسا و بڕیار لە سەرەوە ئەم دامەزراوانە لە بەین ببرێن، چونکە پۆلۆرالیزمی کۆمەڵایەتی هەڵقوڵاو لە فرە ستراکتۆریی لەمپەرە بۆ ئەوەی کە دامەزراوەیەکی تایبەت کارکردی ئەم جۆرە دامەزراوانە کونترۆڵ بکات. بۆیە پارتێك کە لە هەڵبژاردنە ئازادەکاندا سەردەکەوێت و کابینە پێکدێنێت، ئەویش بە یەکێك لە دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی هەژمار دەکرێت و ناتوانێت بە تەنیا گشت دەسەڵات بە دەستەوە بگرێت. لەم جۆرە بارودۆخەدا یاسادانان و دیارکردنی ستراتیژییەکان و ڕێکخستنی سیاسەتی گشتی لە ڕێگەی هاوکاری، دانوساندن، سازشکردن و گفتوگۆ لەگەڵ گشت گرووپەکان دادەڕێژرێن، زۆربەی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە جۆرێك لە جۆرەکان لەم پرۆسەیدا بەشدارن. بە پێچەوانەوە، واتە نافرەیی بوون و تەنیا بەشێکی بچووك بەشداریی لە پرۆسەی سیاسەت دارشتندا دەکات و زۆرینەی کۆمەڵگا لە مافی دیارکردنی چارەنووسیان بێ بەشن.

فرە ستراکتۆری بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مەدەنی مەرجی پێویستە نەك بەس. چونکە دەکرێ لە رواڵەتدا سیستەم خاوەن فرە ستراکتۆری بێت، واتە دامەزراوەگەلی وەك پارت، یەکێتییەکان، سەندیکا و ئەنجوومەنە خۆجێییەکان، بەڵام لە پراکتیکدا سەربەخۆییان نییە. لەم جۆرە بارودۆخەدا ئەم دامەزراوانە کە ساختەن و لە سەرەوە دامەزراون. لە راستیدا پاشماوە و پۆپێکن لە دامەزراوەی جێبەجێکردن و جێبەجێکەری بڕیارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردنن. لەم بارودۆخەدا کەناڵی رادەربڕین و کۆکردنەوەی داواکارییەکان بوونیان نییە و لە راستیدا دەوڵەت داواکاریگەلێك دەخاتەڕوو و وەڵامگەلێکیش دەدۆزێتەوە، بەبێ ئەوەی کە لە پرۆسەی بڕیاردەرکردندا، هاووڵاتیان بەشدار بن، فرە ستراکتۆری پێویستی بە سەربەخۆ بوونی سیستەمە لاوەکییەکانی هەیە. تەنیا لەم چەشنە بارودۆخەدایە کە خەڵك و گرووپە کولتووری، سیاسی و ئابوورییە جۆراوجۆرەکان دەتوانن بەشدارییان هەبێت و بەشێك لە دەسەڵات بۆ خۆیان تەرخانبکەن. چونکە پۆلۆرالیزم کە لەگەڵ خۆیدا فرە ستراکتۆریی دێنێتە کایەوە، پێویستی بە دابەش بوونی دەسەڵات لە نێوان دەوڵەت و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا هەیە. بە پێچەوانەوە دامەزراوەگەلی وەك پارت، سەندیکا، یەکێتییەکان، ئەنجوومەنە خۆجێییەکان و... لە بری ئەوەی کە بەشێك لە ستراکتۆری کۆمەڵگای مەدەنی بن، دەبن بە ستراکتۆرگەی سەر بە دەوڵەت. بۆ نموونە، ئەرکی سەرەکی پارتی سیاسی ناوبژیوانی کردنە لە نێوان داواکارییە جیاوازەکان و گۆڕینیان بۆ سیاسەت. پێویستە پارت بتوانێت لە هەمبەر پێشێلکارییەکانی دیموکراسی و ژێر پێ خستنی یاسا، بەرپەرچدانەوەی جیددیی هەبێت و بەرگری لە مافی هاووڵاتیان بکات. بەم جۆرەش کاتێك کە ئەم دامەزراوانە لە سەرەوە و لە لایەن دەوڵەتەوە دادەمەزرێن، بێگومان دەبێ پاڵپشتی کاری هەڵسوکەوتی حکوومەت بن نەك وەستان لە دژی حکوومەت. سروشتییە نافرەیی ستراکتۆری و





نەبوونی سەربەخۆیی سیستەمە لاوەکییەکان وەك دامەزراوگەلی ناوبژیوان، لەمپەرە بۆ دروستبوونی رۆحیەی لێبوردەیی و پێکەوە ژیانی سیاسی و ئەگەری هەر جۆرە رەخنەگرتن لەکارکردی دەوڵەت و دامەزراوەکانی لە ناو دەبات و لە ئەنجامدا کاربەدەستانی حکوومەت لە هەمبەر دابینکردنی خواست و داواکارییەکانی خەڵك بەرپرسیار و وەڵامدەرەوە نابن. ئەم دۆخەش هێدی هێدی دەبێتە هۆی گەورەتر بوونی دەوڵەت و نوشتی کۆمەڵگای مەدەنی.

بە هەر حاڵ بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی، پێویستە خەڵك دامەزراوەگەلی سەربەخۆیان هەبێت و لە ژێر پشتگیری یاسا و لە رێگەی ئەم دامەزراوانەوە داواکارییەکانیان بۆ سیاسەتمەداران بەرزتر بکەنەوە و کاریگەری بە سەر بڕیارە گرنگ و ستراتیژییەکاندا بنوێنن.

سروشتییە هەر جۆرە گورز وەشاندن و پشتگیری نەکردن لەم دامەزراوانە بەپێی یاسا، بە تێپەر بوونی کات نوشتی کۆمەڵگای مەدەنی و بەرفراوان بوونی پانتای دەسەڵاتی دەوڵەتی لێدەکەوێتەوە.

رەنگدانەوەی فرە ستراکتۆریی و سەربەخۆیی رێژەیی سیستەمە لاوەکییەکانیش دەکرێ لە پەیوەندی نێوان سێ دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، یاسادانان و دادوەریدا ببینرێت. ئەگەر ئەم سێ دەسەڵاتە بتوانن پارێزگاری لە سەربەخۆ بوونی رێژەییان بکەن و دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، هەر دوو دەسەڵاتەکەیتر نەخاتە ژێر کونترۆڵ و دەسترۆیی خۆیدا، بە شێوەیەکی راستەقینە دامەزراوەی جێبەجێ کردن، یاسادانان و دادوەری دەبن بە کەناڵی متمانە پێکراو بۆ کۆکردنەوەی داواکارییەکان و لە بان دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا دەتوانن بە چالاکانە بەشداری لە گۆڕینی داواکارییەکان بۆ سیاسەت بکەن.



**٢. دژە یاسا بوون:**

هەر وەك بینرا، بەپێی ئەو پێناسەیەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنی کرا، کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لە پانتایەك لە دامەزراوە سەربەخۆکان و لە ژێر پشتگیری یاسادا. بەم جۆرەش نەبوونی یاسا و دروست جێبەجێ نەکردنی و رێز لێ نەگرتنی سەرەڕای ئەوەی کە فاکتەری لەمپەر نانەوەیە لە بەردەم گەشەی کۆمەڵگای مەدەنیدا، لە هەمان کاتدا دەتوانێت دەستکەوتەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە فیڕۆ بدات. لە بنەڕەتدا پێویستە یاسا لە پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی ئابوری، سیاسی و کۆمەڵایەتیدا جێگیر بکرێت، نەك تەنیا لە لایەن چەند یاسانانەوە گەڵاڵە و لێکدانەوەی بۆ بکرێت. دەبێ یاسا لە پەیوەندییەکانی نێوان هاووڵاتیان، نێوان نوخبەکان و نێوان خەڵك و نوخبەکاندا، پێگەی راستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە، لێکدانەوەی بێ بەرپرسانە لە یاسا، جێگیر بوونی پەیوەندی لە بڕی رێسا، مەیلدار بوون بەرەو تایبەتگەرایی لە بڕی گشتگەرایی، نایەکسانی لە هەمبەر یاسادا، بوونی بۆشایی لە نێوان یاسا و واقیعییەتدا، جێبەجێ نەکردنی راست و دروستی یاساکان، کۆمەڵە فاکتەرێك کە بە توندی لە بەردەم سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مەدەنیدا لەمپەر دەنوێنن و سەرەڕای خولّقاندنی نائەمنی و کەش و هەوای ترس و تۆقاندن، متمانەی دوو لایەنەی نێوان خەڵك و دەوڵەتیش لە بەین دەبات، تاڕادەیەك کە ملکەچ نەبوون بۆ یاساکان و سەرپێچی کردن لە رێساکان وەك بەهاو رێز لێنان لە یاسا و رێسا بە دژە بەها هەژمار دەکرێت.

شایانی ئاماژە پێدانە کە دابینکردنی مافی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری وەك گشت نموونە (نموذج) کاتی رەفتاری تەنیا لە سەرەوە پەرەی پێنادرێت. چونکە یاسادانەران و جێبەجێکاران نموونەی (نموذج) هزری و رەفتارییەکەیان لە جەستەی کۆمەڵگاوە وەردەگرن، بۆیە پێویستە لە پرۆسەی بە کۆمەڵگا بووندا، کولتووری نابەرپرسیارێتی لە بەین ببرێت و کولتووری وەڵامدانەوە جێی بگرێتەوە. بێگومان گەرەنتی کردنی مافی تاکەکان لە رێگەی دام و دەزگا کۆمەڵایەتییەکانەوە دابین دەکرێت نەك تەنیا لە رێگەی راسپاردەگەلی رەوشتی و تاکە کەسییەوە.





**٣. دەرباز بوونی ناسەرکەوتوانە لە قۆناغی بنیاتنانی دەوڵەت – نەتەوە**

چۆنێتی دەرباز بوون لە قۆناغی بنیاتنانی دەوڵەت- نەتەوە لە بەردەوام بوونی ژیانی کۆمەڵگای مەدەنیدا رۆڵێکی گرنگی هەیە. هەندێ جار بۆ دەرباز بوون لەم قۆناغە ئەوپەڕی زۆر لێکردن بۆ تێکەڵ بە یەکتر کردنی (ادغام) سیاسی لە پێناو دامەزراندنی حکوومەتێکی ناوەندی بەهێز، بەکار دەهێنرێت، یاخود مومکینە ئەم پرۆسەیە لە میانەی سازشکردن، دانوساندن و گفتوگۆ و بە شێوازێکی ئاشتی خوازانە ئەنجامبدرێت. ئەگەرچی پێویستە لە پرۆسەی نوێگەری سیاسیدا وابەستەیی بوونی (التبعیە) نەژادیی و خۆجێیی بۆ وەفادارێتی نەتەوەیی بگۆڕدرێت و چەمکگەلی وەك ئاسایشی نەتەوەیی، گەشەسەندنی نەتەوەیی و بەرژەوەندی جێگەی چەمکە بەرتەسکەکان بگرنەوە و ئەم کارەش میکرۆ ناسیۆنالیزمەکان بۆ مایکرۆ ناسیۆنالیزمەکان دەگۆڕێت، بەڵام لە رووی پراکتیکییەوە رووبەڕووی جۆرە پارۆدۆکسێك (لوغز)مان دەکاتەوە. چونکە لە لایەکەوە وردە کولتوورەکان لەمپەر لە بەردەم دامەزراندنی حکوومەتێکی ناوەندی بەهێز دروستدەکەن، لە لایەکیترەوە سەرکوتکردنی ئەم رەگەزانە (وردە کولتوور) لە قۆناغەکانیتردا گرفتگەلی جیددی، وەکو قەیرانی بەشداری سیاسی دەخولقێنن، تا رادەیەك کە پێشگیری لە هاتنە ناوەوەی تاك و گرووپە جۆراوجۆرەکان بۆ ناو پرۆسەی سیاسەت دارِشتندا دەکەن و وەستان لە دژی فرە ستراکتۆری، بەرفراوان بوونی پانتای دەسەڵاتی دەوڵەت و نوشتی کۆمەڵگای مەدەنی لێدەکەوێتەوە.

بە هەر حاڵ ئەگەر بتوانرێت قەیرانی یەکپارچەسازیی لە رێگەی ئاشتی خوازانەوە چارەسەر بکرێت و لەو میانەیەشدا گرووپبەندی دەستەیی بەرەو گرووپبەندی ئەنجوومەنی بگۆڕێت، ئەم کارە یارمەتیدەری گەشەی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێت. لە زۆرێك لە کۆمەڵگاکانی جیهانی گەشە نەسەندوودا بە هۆی دەرباز بوونی ناسەرکەوتوانە لە پرۆسەی بنیاتنانی دەوڵەت- نەتەوە و دامەزراندنی حکوومەتی ناوەندی، ئەویش لە رێگەی یەکپارچەکردنی زۆرداری، لە سەرهەڵدانی گرووپە جۆراوجۆرە سیاسی، ئابووری



و کولتووری پشتگیری دەکرێت کە خودی ئەمەش گرفتگەلی جۆراوجۆر بۆ بنیاتنانی دامەزراوە مەدەنییەکان دروستدەکات. ترس لە سەرهەڵدانی گرووپگەلی دژی ناوەند، یەکێك لەو بابەتانەیە کە دەوڵەتەکان یەکگرتوو بوون (وحدویە) لە پۆلۆرالیزم بە باشتر دەزانن و فرە ستراکتۆری بە رێگە خۆشکەری دابەشکردنی دەسەڵات و سەرهەڵدانی رکابەری نوێ لە پانتای سیاسەتدا هەژمار دەکەن.

**٤. دەوڵەتگەرایی (ناوەندگەرایی):**

یەکێك لە هزرە زاڵەکانی لە کۆمەڵگا گەشە نەسەندووەکان (کە خۆشی هەڵقوڵاوی چۆنێتی وەرچەرخانە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانە)، جەختکردن و پشت بەستنی لە رادەبەدەر لە سەر رۆڵی دەوڵەتە، چونکە لە زۆرێك لەم کۆمەڵگایانەدا لە پرۆسەی بنیاتنانی دەوڵەتدا زۆرێك لە رێکخراوە جەماوەرییەکان لە ناو چوون و تەنیا دامەزراوەی حکوومییەکان بە سەر کۆمەڵگادا زاڵن. بۆیە دەوڵەت دەسەڵاتەکەی بە سەر گشت بەشەکانی کۆمەڵگادا سەپاندووە و لە نێوان خەڵك کولتوورێك سەریهەڵداوە کە بەبێ یارمەتیدانی حکوومەت ئەوان ناتوانن هیچ کارێك ئەنجامبدەن. ئەم دۆخەش کاتێك کە خەڵك بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ژیان گوێڕایەڵی حکوومەت بن، ئاڵۆزتر دەبێتەوە، ئەگەرچی یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆیی رێژەیی ئابووری خەڵك لە دەوڵەتە، بەڵام لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا، خەڵك دەوڵەت و دام و دەزگا بۆرۆکراسییەکانی وەك دەزگایەکی خێراخوازی وێنا دەکەن. کە پێویستە بەردەوام بە کەسانی ژێر سەرپەرشتی خۆی یارمەتی بدات. ئەم جۆرە بۆچوونە سەرەڕای ئەوەی کە بارقورسی بۆ بۆرۆکراسی دروستدەکات و داخوازییەکانی خەڵك لە دەوڵەت زیاد دەکات، لە هەمان کاتدا بە فاکتەری سەرەکی لە ناوبردنی سەربەخۆیی کەسایەتی، داهێنان، متمانە بە خۆکردن و رۆحیەی خۆ بەڕێوەبردن (کە لە پێداویستییەکانی گەشەی کۆمەڵگای مەدەنییە) هەژمار دەکرێت. بەم جۆرەش کاتێك کە دەوڵەت مۆبیلیز کردنی سیاسی، بە کۆمەڵگا بوونی سیاسی، پەیوەندی





سیاسی، گردبوونەوە و دەربڕینی داواکارییەکان قۆرغ دەکات، بوار بۆ چالاکی کۆمەڵگای مەدەنی نامێنێتەوە.

لە چوارچێوەی گەشەی کۆمەڵگای مەدەنیدا، دەوڵەت چاودێرێکی بێ لایەنە کە چاودێری مشتومڕ، سازش و ڕێککەوتنی نێوان گرووپە جۆراجۆرەکان دەکات. پرسی بێ لایەنی دەوڵەت بەندە بە بوونی حکوومەتی سنووردار و لێك جیاکردنەوەی ژیانی تایبەتی لە ژیانی گشتی لە چوارچێوەی پۆلۆرالیزمدا. دەبێ دەوڵەت بۆ گەشەی کۆمەڵگای مەدەنی وەك چاودێرێکی بێ لایەن دەرفەت بڕەخسێنێت کە شێوازە لێك جیاوازەکانی ژیان پێکەوە بژین و لە هەمان کاتدا سەربەخۆیی کەسیش پارێزراو بێت. هەڵبەت پێویستە بە پێی پۆلۆرالیزمەوە سەربەخۆی کەسی روون بکرێتەوە. بەم جۆرەش ئەگەر تاکێك چەندین هەڵبژاردنی (خیارات) پەسەندکراوە، لە رووی ئاکارییەوە، هەبێت، ئەو کات ئەو دەتوانێت ژیانێکی سەربەخۆی هەبێت. بەم پێیە ئەگەر لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا سەربەخۆیی کارکردن بە ئایدیالێك هەژمار بکرێت، لەم جۆرە بارودۆخەدا پێویستی هەڵسوکەوتێکی رەوشتی لەگەڵیدا ئەنجامبدرێت.

### ٥. بۆرۆکراتیزە بوونی سیاسەت و بە سیاسەت بوونی بۆرۆکراسی:

هەندێ جار دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەك پارتەکان، سەندیکاکان، ئەنجوومەنەکان و یەکێتییەکان تا رادەیەك گیرۆدەی رێساکان، دیسپلینی ئاڵۆز و پلەبەندی (سلسلە مراتب) دەبنەوە کە ئەندامانی ئەم دامەزراوانە و هاووڵاتیان ناتوانن بە ئاسانی خواست و داواکارییەکانیان بۆ ئاستە بەرزەکانی بڕیار دەرکردن و سیاسەت داڕشتن بەرز بکەنەوە. بە چەشنێك کە بوونی جۆرە ئۆلیگاریشییەك لەمپەرە لە بەردەم گۆڕینی داواکارییەکان بە سیاسەت. لەم جۆرە بارودۆخەدا دامەزراوەکان دەبن بە دامودەزگای بەرفراوان و بێ کەڵك کە ئامانجەکان دەکەونە ژێر رکێفی ئامرازەکاندا.

هەروەها سیستەمی کارگێڕی کە پێویستە لە جێبەجێ کردنی بڕیار و سیاسەتەکاندا رۆڵی هەبێت، چونکە سەرکردە سیاسییەکان بۆ بەدەستهێنانی



زانیارییەکان جیا لە بۆرۆکراسی هیچ کەناڵێکی تریان لەبەردەستدا نییە، بۆیە سیستەم دەبێت بە سیستەمێکی سیاسیکراو و زۆرجار دەرکردنی بڕیار دابەشکراون و بەهاییەکان کە بارگاویی سیاسییان هەیە. کارکردنی بۆرۆکراسی کە جێبەجێ کردنی بڕیارە سیاسییەکان دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. دەستێوەردانی حیزبی لە دامەزراندنی کەسەکان لە ئاستە مامناوەندی و خوارووییەکانی کارگێڕیدا، سەرەڕای ئەوەی کە فاکتەرەکانی ناسەقامگیریی سیستەمی کارگێڕی فەراهەم دەکات، یارمەتی بە سیاسی بوونی بۆرۆکراسی دەدات. گشت ئەم فاکتەرانە لە پاشای دەسەڵاتی کۆمەڵگای مەدەنی کەم دەکاتەوە و سەرەڕای لەناو بردنی دەستکەوتەکانی، زیاد بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتی لێدەکەوێتەوە.





## ئەنجامگیریی:

ئەو لەمپەرانەی بەردەم دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی کە خوێندنەوەمان بۆ کرد لێك جیا نین. بەڵکو هەر یەك لەم لەمپەرانە بەشێوەیەکی بەرەو ژۆر (تصاعدی) کاردەکەن خاڵە لاوازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی زۆرتر دەکەن.

بێگومان باسکردن لە کۆمەڵگای مەدەنی لە میانەی پرۆسەی نوێگەری سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیدا گەڵاڵە دەبێت و ئەویش لە کاتێکدایە کە بەهۆی پەیوەندی زۆری نێوان سیستەم و ژینگەی ناوخۆ، هەروەها ئاڵوگۆڕی روو لە زیاد بوونی نێوان ژینگەی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی هێزگەلی نوێ سەرهەڵدەدەن و داواکاریی نوێ گەڵاڵە دەکەن کە بەدیهێنانیان پێویستی بە گۆڕینی سیستەمی هەیە. بۆیە سەرهەڵدانی دامەزراوە ناحکوومییەکان و سەربەخۆیی رێژەیی ئەم دامەزراوانە لە کارەکاندا دەتوانێت لە هەموارکردنی دەسەڵات لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا رۆڵی گرنگی هەبێت. ئەم رەوتەش بەربەست لە بەردەم کەڵەکە بوونی دەسەڵات دروستدەکات و بوار بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی دەسەڵات دەڕەخسێت. لەم بارودۆخەدا زۆرێك لە کارکردن کە پێشتر لە قورغی دەوڵەتدا بوون (بەتایبەتیش بە کۆمەڵگا بوون، پەیوەندییەکان و دامەزراندنی سیاسی) بۆ دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەگوازرێتەوە و بەم جۆرەش پانتاو بوارگەلی نوێ لە نێوان خەڵك و دەوڵەتدا دروستدەبێت کە لە ژێر پشتگیریی یاسادا یارمەتی دامەزراندنی خەڵك سالاری دەدات.



# بەشی دەیەم

# بۆرۆکراسی و دیموکراسی

زۆرتر لە یەك سەدە و نیوە کە توێژەران و سیاسەتمەداران باس لە پەیوەندی نێوان دیموکراسی و بۆرۆکراسی دەکەن. لە راستیدا، بەپێی نەریتەکی لیبرالیێستی، دەزگا کارگێڕییەکان ناچار بە جێبەجێ کردنی بڕیارە سیاسییەکانن. هەندێ بە رەشبینییەوە سەیری بۆرۆکراسی دەکەن و رزگار بوون لە کۆت و بەندەکانی بۆرۆکراسی بە ئاسانی نازانن، تاڕادەیەك کە ئەم دیاردەیە بە یەکێك لە واقیعەکانی ژیانی سەردەم هەژمار دەکەن. بە بڕوای مارکسیستەکان لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکاندا گشت دامەزراوەکانی هەڵبژاردن و ئۆرگانە کارگێڕییەکان لەلایەن بۆرژوازییەوە کۆنترۆڵ دەکرێن کاتێك کە سیستەمی سیاسی رووبەڕووی نەبوونی بەها دیموکراسییەکان دەبێتەوە، لەم کاتەدا زەمینەی تووش بوون بەم ناخۆشییە[واتە بۆرۆکراسی] فەراهەم دەبێت. مارکس و ئەنگلز حکوومەتە هەڵبژاردراوەکانی رۆژئاوا بە ئامرازی دەستی چینی بۆرژوازی دەزانن. بەبۆچوونی مارکس، بریتییە لە دام و دەزگایەك کە چینی دەسەڵاتدار (بورژوا) لە رێگەوە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکات. مارکس لە شوێنێکی تردا دام و دەزگا جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت بە چاو و گوێ و دەست و پێی خاوەنداران وەسفدەکات. لە سانفێستی کۆمۆنیزمیشدا، دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و دەوڵەتانی سەرمایەداریی وەك دەستەی بەڕێوەبەران کە تیایدا چینی بۆرژواز ڕۆڵی بڕیاردەری راستەقینەی هەیە، دەزانێت. بە بۆچوونی ئەم گرووپە گشت مشتومڕی رکابەرێتییەکان کە لە چوارچێوەی دام و دەزگاکانی بۆرۆکراسیدا ئەنجامدەدرێن، دژ بە یەك بوونێکە لە نێوان دیموکراسی، ئۆریستۆکراتی دەسەڵاتدار و بەدەستهێنانی مافی دەنگدان.

ئەم دژ بە یەك بوونە هێدی هێدی دەبێت بە مشتومڕ و جیاوازیی راستەقینەی چینایەتی. بەم جۆرەش ئۆرگانی بۆرۆکراسی دەوڵەت، بە شێوازە زۆردارییەکەی (قهریە)، یەکێکە لە خەسلەتە زەقەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداریی، کە بەردەوام ئامرازی دەستی چینی بورژوایە.

هەڵوێستی دوژمنکارانەی مارکسیست و لیبراڵەکان، لە نێوان ساڵانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و شەڕی یەکەمی جیهانی، بەڵگەن لەسەر پەرەسەندنی ماشێنی بۆرۆکراسی وەك دامەزراوەیەکی بەهێزی کۆمەڵگا پیشەسازییەکان. ماکس ڤێبر سەرەڕای شیکردنەوەی ساکارانە لە بۆرۆکراسی، ئاماژە بە گرنگترین رەگەزی پێکهێنەری بۆرۆکراسی، واتە دەسەڵات، دەکات. ئەو بڕوای بە سێ جۆرە دەسەڵات هەبوو کە بریتین لە:

١. کاریزماتیك







٢. تەقلیدی

٣. یاسایی، عەقلانی

بە بۆچوونی ڤێبر، دەسەڵاتی کاریزمانیك کە زۆرتر پەیوندی بە دۆخێکی قارەمانانە و پیرۆزگەراییەوە هەیە، دیاردەیەکی کورت خایەنە کە لە قۆناغێکی پێشووی کۆمەڵایەتیدا سەرهەڵدەدات. پەیوەندی نێوان سەرکردە و پەیڕەو هەل و مەرجێك دروستدەکات کە لە میانەیدا لە پەرەسەندنی دامەزراوە سیاسی، کارگێڕی، کۆمەڵایەتی و ئابووری کەم دەکاتەوە، بە چەشنێك کە نەمانی سەرکردەی کاریزما بۆشاییەکی گەورە لە نێوان ستراکتۆرە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا دروستدەکات.

دەسەڵاتی تەقلیدی، بەپێی بنەماگەلی بڕوا بوو بە نەریتە کۆنەکان، کە مەشروعییەت بە سیستەم دەبەخشێن و دەسەڵات جێبەجێ دەکرێن، سەرهەڵدەدات. لە کاتێکدا کە لاوازیی دەسەڵاتی کاریزماتیك لە سەقامگیر نەبوونیدایە، بەڵام لاوازیی دەسەڵاتی تەقلیدیی لە ناوەڕۆکی وەستاوی (جهود) ئەم دەسەلاتەدایە. هەر بۆیەش، دەسەڵاتی یاسایی عەقلانی لەڕووی کارکردەوە لە دوو دەسەڵاتەکەیدا باشترە. بە بڕوای ڤێبر ئەم جۆرە دەسەڵاتە کاتێك دروستدەبێت کە تاکەکانی ناو سیستەمی کارگێڕی، بڕوایان بە یاسایی بوونی یاسا بەرقەرارەکان هەبێت، بێگومان کەسانێك کە لە ترۆیکی سیستەمی بۆرۆکراسیدان، دەتوانن لە هێنانەدیی ئەم دەسەڵاتە رۆڵێکی گرنگ بگێڕن. هەڵبەت ڤێبر لە چوارچێوەی وەرچەرخانەکانی کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا، خوێندنەوەی بۆ گەشەسەندنی بۆرۆکراسی کردووە، بە چەشنێك کە بۆرۆکراتیزە بوون لە ئەنجامی گەشەسەندنی سیستەمێکی ئاڵۆزی ئابووری و سیاسی دەزانێت و تەنانەت لەمەش زۆرتر دەڕوات و دەڵێت کە سەقامگیربوونی سیستەمی بۆرۆکراتیك دەتوانێت یارمەتیدەری گەشەسەندنی گشت دامەزراوەکانیتری کۆمەڵگا بێت.

ئەگەرچی لەوانەیە لە قۆناغی یەکەمدا وەها بێتە بەرچاو کە بوونی سیستەمێکی کارگێڕی کارامە دەتوانێت لە بەرزکردنەوەی توانایی سیستەم بۆ وەڵامدانەوە بە داواکارییەکانی خەڵك کاریگەر بێت، بەڵام بوونی سیستەمێکی بۆرۆکراتیك، لەوانەیە لەگەڵ بەهاکانی دیموکراسی ناکۆك بێت. واتە پەرەسەندنی سیستەمی بۆرۆکراسی لەگەڵ دامەزراندنی دامەزراوەکانی هەڵبژاردن ناکۆکیی هەیە. ڤێبر تەنازت کاتیرانەوە. بە بۆچوونی ڤێبر بۆرۆکراتەکان تەنیا بڕیارگەلێك جێبەجێ دەکەن کە لەلایەن



سیاسەتمەدارەکانەوە دەرکرا بن. سەرەڕای بۆچوونەکانی ڤێبر سەبارەت بە ئەرکی جێبەجێ کارانەی بۆرۆکراتەکان، لە پڕاکتیکدا دەبینین کە لە زۆرێك کۆمەڵگادا، بەتایبەتیش لە وڵاتانی لە دۆخی گەشەسەندندا، بۆرۆکراسی ناتوانێت چاودێرێکی بێ لایەن بێت و لە سیاسەت دوورەپەرێز بێت. چونکە لە زۆرێك لەم کۆمەڵگایانەدا، چونکە سیاسەتمەداران بۆ دەرکردنی بڕیارە گرنگەکان و دیارکردنی رێبازی سیستەم، جیا لە بۆرۆکراسی هیچ کەناڵێکی تری متمانە پێکراویان نییە، بۆیە سیستەمی بۆرۆکراسی لە حاڵەتی بێ لایەن بوونەوە دەردێت و دەبێت بە (سیاسی بوون).

لەبوو وڵاتانی رۆژئاوادا، سەرەڕای بوونی سیستەمی هەڵبژاردن، بەهۆی پێداویستی دامەزراوەکان بە کەسانی پسپۆڕ، هەوڵدەدرێت کەسانی هەڵنەبژێردراو بۆ دەرکردنی بڕیارە بەهاییەکان، بەکار بهێنرێن. ئەگەرچی لەوانەیە بوونی کەسانی دامەزراو (انتخابی) لەگەڵ بەها دیموکراتیکەکانی رۆژئاوادا ناکۆك بێت، بەڵام لێرەدا، کارامەیی لەسەر حیسابی کەمکردنەوەی دیموکراسی دێت، بۆشاییەکیتر کە لە مودیلی ئایدەیالی ڤێبردا هەیە، پەیوەستە بە ماشێنی بوونی بۆرۆکراسییەوە. جەختکردنەوەی لە رادەبەدەری ڤێبر لەسەر حکوومەتی یاسا، پلەبەندی (سلسلە مراتب) و گوێڕایەڵی بێ چەند و چۆن لە بڕیارەکانی سەرووتر لە دام و دەزگای بۆرۆکراسیدا، بووە هۆی پشتگوێ خستنی لایەنی مرۆڤی و رەوشتی. چونکە ئەو شتەی یارمەتی دامەزراوە دەدات کە بە ئامانجەکانی بگات، بوونی پەیوەندی مرۆڤانەیی ساغلەم، رۆحیەی بەرز و بوونی پاڵنەر، کە گشتیان لە نوێگەر و کارامەیی بۆرۆکراسیدا کاریگەرن. چونکە دیاردەی دیکتاتۆری تواناییەکی شاراوەی تایبەتی هەیە (تەنانەت لە کورتخایەنیشدا)، هەر ئەم خەسڵەتە یارمەتی بنیاتنانی بۆرۆکراسی چەقگرتوو لە ژێر حوکمی دیکتاتۆریدا، دەدات. لەوانەیە لە قۆناغەکانی سەرەتادا پشت بەست بە سیستەمی ئۆتۆکراتیك و بەکارهێنانی زۆر و سەرکوت کردن، لە رووکەشدا مەشروعییەتی سیستەم بەرز بکاتەوە، بەڵام لە درێژخایەندا بە پەیوەندی نێوان زۆر لێکردن و گوشار لەگەڵ مەشروعییەتی سیاسیدا، ئەنجامی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە. ڤێبر بە رەخنە گرتن لە مارکسیستەکان سەبارەت بە بۆرۆکراسی، وەها بۆی دەچێت کە گەشەسەندنی بۆرۆکراسی جۆرە هێزێك بە دەوڵەت دەبەخشێت کە دەتوانێت خۆی لە تەوقی باڵادەستی بۆرژوازی رزگاربکات. بەم جۆرەش کاتێك کە مارکس تەنیا جەخت لە سیستەمی بەرهەمهێنان دەکات، ڤێبر جەخت لە سەر سیستەمی دەسەڵات دەکات. ڤێبر بە هیچ شێوەیەك بۆچوونی مارکسیستەکان سەبارەت بە لە ناو چوونی دەوڵەت لە ژێر سیستەمی سۆشیالیستدا پەسەند





ناکات، بەڵکو بە کۆمەڵایەتی بوونی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان تەنیا لە ڕێگەی [چۆنیەتی] بەڕێوەبردنی دەوڵەت و سیستەمی بۆرۆکراسی دەزانێت.

((ربرتومیشل)) لە پەرتووکەکەیدا بە ناونیشانی ((پارتە سیاسییەکان)) بەشێك لە تێزی ڤێبری سەبارەت بە گەشەی دەسەڵاتی کاربەدەستە بۆرۆکراسییەکان، خوێندنەوەی بۆ کردووە. میشل دەڵێت کە ستراکتۆر و پێکهاتەی ناو پارتە دیموکراتیکە جەماوەرییەکان بە جۆرێکە کە سەرەڕای مەیلدار بوون بۆ ناوەندگەرایی و ستەمکاریی، پاش ماوەیەك بڕیارەکان دەکەونە دەست ژمارەیەکی کەم و کونترۆڵکردنی حیزب لە دەست ئەندامانی دەردەچێت و دەگۆڕدرێت بۆ سیستەمێکی ئۆلیگارش. ئەم لە توێژینەوەکەیدا ئاماژە دەدات کە لە پارتە سۆشیالیستییەکان و یەکێتییە کرێکارییەکاندا، کاربەدەستە چالاکەکانی ئەم دامەزراوانە [پارتی سوشیال و یەکێتی کرێکاران] لە ڕووی بوونی کەسی شارەزا تیادا پێگەیەکی بەهێزتریان هەیە و لە پرۆسەی ڕکابەرێتی نێوان پارتەکاندا وەپێش ڕکابەرە ئاماتۆرەکان دەکەون. هێدی هێدی مشتومڕ و ڕکابەرێتییە حیزبییەکان لە چوارچێوەی حیزبەوە دەردەکەوێت و گشت دامەزراوە بۆرۆکراتیکەکان دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە، لەوانەیە هۆی دژایەتیکردنی ڤێبر لە دەستێوەردانی بۆرۆکراتەکان لە کاروباری سیاسیدا، ترس لە بۆرۆکراتیزە بوونی دامەزراوە سیاسییەکان و بە سیاسی بوونی بۆرۆکراسی بوبێت، کە لە ئەنجامی ئەم دۆخەدا سیستەمی کۆمەڵایەتی ڕووبەڕووی ئاژاوە و لێکترازان ببێتەوە. میشل لەو بڕوایەدا بوو کە بە سیاسی بوونی بۆرۆکراسی دەبێتە هۆی ئەوەی کە فەرمانبەرە فەرمییەکانی دام و دەزگاکان پێگەیەکی بەهێزتر لە هەمبەر سیاسەتمەداران وەربگرن. هەڵبەت لەم پرۆسەیەدا ئەگەری ئەوە هەیە کە سیاسەتمەدارە توندڕەوەکانی سۆشیالیستی بەرەو پارێزگاریی مەیلدار بن و دواتر لەگەڵ بۆرژوادا کە لە دۆخی بەرقەرار ڕازین سازش بکەن. لەم پرۆسەیەدا، چونکە بۆرۆکراتەکان ناتوانن لە گشت پابەندیی (التزامات) سیاسەتمەدارە هەڵبژاردراوەکاندا هاوپشك بن و بۆ لە ئەستۆگرتنی ئەم جۆرە بەرپرسیارێتییە ئامادەگیان نییە، بۆ پێکدادان و ناکۆکیگەلێك سەر هەڵدەدەن سەری ڕمی هێرشکردنی میشل ئاراستەی سۆشیال دیموکراتەکان کراوە، چونکە بە بۆچوونی ئەو ئەم تاقمە هەوڵدەدەن کە لە ڕێگەی کۆنترۆڵی دەوڵەتەوە لە میانەی پارتی سیاسی جەماوەرییەوە لە ڕێگەی ئاشتیخوازانەوە هاندەری گۆڕان و وەرچەرخانەکانی کۆمەڵایەتی بن. میشل بە ناڕاستەوخۆیانە ئاماژە بە پرسگەلێك دەکات کە پرولتاریا دوای کونترۆڵکردنی ئامرازە سیاسییەکان ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە لایەکیترەوە، ((مۆسکا)) باس لە جەبری



بوونی دەسەڵاتی چەقگرتوو (ناوەندگەرا) لە وڵاتانی سۆشیالیستی دەکات و سیستەمی ئۆتۆکراتیکی بە بەربەستێك بۆ گەیشتنی دامەزراوە دیموکراتیکەکان بە ناوەندی دەسەڵات دەزانێت. ئەو دەڵێت کە چ بۆرۆکراتە فەرمییەکانی دەوڵەت پێگەیەکی بەهێزتریان هەبێت و چ سیاسەتمەداران لە ژێر ئەم چەشنە بارودۆخەدا لە بڕی خزمەتکردن بە خەڵك ببن بە بۆرۆکرات، لە کارکردی سیستەمدا هیچ گۆڕانێك ڕوو نادات. لە هەلومەرجی فرە لایەنەی ستراکتۆرە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگادا، لێك جیاکردنەوەی بۆرۆکراتەکان لە سیاسەتمەداران ئاستەمە. ئەگەر سیستەمی سیاسی توانایی بەرچاوی هەبێت و بتوانێت وەڵامدەرەوەی داواکارییەکانی خەڵك بێت، لەم کاتەدا بۆرۆکراتیزە بوونی سیاسەتمەداران و بە سیاسی بوونی بۆرۆکراتەکان، ناتوانێت بەهاکانی دیموکراسی لاسەنگ بکات. بۆ پاراستنی ئەم بەهایانە، پێویستە پشتگیری لە قۆرغکردنی دەسەڵات بکرێت. بۆ دوورکەوتن لە سەرهەڵدانی ئۆتۆکراسی پێویستە بەهێز بوونی دامەزراوە دیموکراتیکییەکانی جەماوەری (کە ئەوەیش دەتوانێت ببێت بە فاکتەری ڕێگر یاخود کەمکردنەوەی قۆرغکردن) پشتگوێ نەخرێت. بوونی ژێدەری هێزیتر دەتوانێت لە قەبارەی قۆرغکردن کەم بکاتەوە و لە درێژخایەندا سەرەڕای لاوازکردنی ئۆتۆکراسی زەمینە بۆ ئازادی و بەرقەرارکردنی مافە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان هەمواربکات. بەم جۆرەش لە ڕێگەی کونترۆڵ و چاودێری کردنی کاروباری ئابووری و سیاسی — لە ڕێگەی کەناڵە ناحکوومی و نا بۆرۆکراتیکەکانەوە و لە ڕێگەی بەجەماوەریکردنی دامەزراوە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکانەوە- دەکرێ بوار بۆ دیموکراتیزە کردنی بۆرۆکراسی و دامەزراوە سیاسییەکان فەراهەم بکرێت. بە بڕوای ((کاوۆتسکی)) بۆرۆکراتیزە بوونی لەسەرخۆیانەی سیستەمی سەرمایەداری ڕێگەیەکە کە لە میانەیدا سەرمایەداران دەکەونە ژێر کونترۆڵی دەوڵەتەوە، لەم کاتەدا پێویستە پرۆلتاریا لە ڕێگەی بەکار هێنانی ئامرازە کونترۆڵی دەوڵەتەوە، لەم کاتەدا پێویستە پرۆلتاریا لە ڕێگەی بەکار هێنانی ئامرازە مەشروعەکانی پەرلەمانی و سیاسی و هەندێ جاریش لە ڕێگەی مانگرتنی گشتییەوە، جڵەوی دەوڵەت بگرنە دەست، بەڵام دەبێ هەوڵ بۆ لە ناو بردنی [واتە دەوڵەت] نەدرێت بەم جۆرەش دەبینین کە کائۆتسکی پرووسەی بۆرۆکراتیزە بوونی سیستەمی بۆرژوازی بە ئامرازێك بۆ لاوازکردنی سەرمایەداری دەزانێت بە بۆچوونی ئەو ئەگەرچی مومکینە لە سەرەتادا پەرەسەندنی بۆرۆکراسی هەندێ لە بەها دیموکراتیکەکان لاسەنگ بکات. بەڵام لە درێژخایەندا دەکرێ





سەرەڕای پاراستنی دەوڵەت، هێدی هێدی دەتوانرێت کە ئاسەوارەکانی بۆرۆکراسی بۆ پاراستنی ئازادییەکانی مرۆڤ لە سیستەمی سیاسیدا دوور بخرێتەوە.

((لێنین)) کائۆتسکی بە هۆی کەمتەرخەمی لە ناسینی بیرۆکەی مارکسیزم سەرزەنشت دەکات. (کە تیایدا دەوڵەت بە دام و دەزگای چینی فەرمانڕەوا دەزانێت و تەنیا ڕێگەی بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتی بۆرژوازی لە رووخاندنیدا دەزانێت). لە پراکتیکدا بینرا کە دوای سەرکەوتنی بلشویکەکان لە شۆڕشی ئۆکتوبەری ١٩١٧دا، پێویست بوون بە دەوڵەتێك کە خاوەن هێز و دەسەڵاتی سەرکوتکردن بۆ بەرەنگار بوونەوەی نەیارانی شۆڕش بێت و بتوانێت کۆمەڵگایەکی سۆشیالیستی بنیات بنێت، هەستپێکرا تاڕادەیەك کە دام و دەزگای بەرفراراوانی حیزب بوو بە دێوێکی زەبەلاحی بۆرۆکراسی. نەبوونی ڕێکخراو و دام و دەزگای بەرهەڵستکار بە فاکتەرێکی پەرەسەندنی بۆرۆکراسی هەژمار دەکرا.

بەم جۆرەش پێداچوونەوە لە ناوەڕۆکی بیرۆکەی مارکسیزم بووبە هۆی بەهێز بوونی دەوڵەت و گەشەسەندنی بۆرۆکراسی، تاڕادەیەك کە ((ستالین)) سەرەڕای پیادەکردنی ((سۆشیالیزم لە وڵاتێکدا))، بە بیانووی نەهێشتنی مەترسی هێزە بۆرژوازییەکان و تا [کاتی] سەرهەڵدانی ((شۆڕشی سۆشیالیستی جیهانی))، نەك تەنیا بوونی بۆرۆکراسی بە پێویست دەزانی، بەڵکو رۆژ لە دوای رۆژ پەرەی بە پانتای دەسەڵات و کاری بۆرۆکراسی دا. بەم جۆرەش دەبینین کە شۆڕشگێڕانی سۆڤیەت (لێنین و ستالین) دواجار ناچار بوون کە بەشێك لە واقعییەتی بۆرۆکراتیك پەسەند بکەن و ڕەتی لایەنە ئانارئیستەکانی تیۆری مارکس و ئەنگلز بکەنەوە. لێنین و ستالین سەبارەت بە ئەگەری ڕوودانی ناکۆکی لە نێوان پرۆلتاریا (بە ناو کونترۆڵکارانی دەوڵەت) و کاربەدەستانی بۆرۆکراتیك (کونترۆڵکارانی راستەقینەی دەوڵەت) بێ دەنگی دەنوێنن، ئەو رۆڵە گرنگەی کە شۆڕشگێڕانی سوڤیەت لە پێش و پاش شۆڕش بە حیزبیاندا، هەروەها جەختکردنەوەی لە رادە بەدەر لە سەر بیرۆکەی ((چەقگرتنی (تمرکز) دیموکراتیك)) وەك پرەنسیپێکی ڕێکخستن، فاکتەرگەلێك بوون کە لە پەرەسەندنی بۆرۆکراسی لە سوڤیەتدا رۆڵی گرنگیان گێڕا. ئەنجام ئەوە بوو کە بۆرۆکراتیزە بوونی سیستەمی سیاسی بارودۆخێکی خولقاند کە بزاڤی کۆمۆنیستی بە پێچەوانەی ئاراستە دیارکراوەکەی هەنگاوی نا. باسکردن لە سەر ئەم جۆرە بابەتانە درێژەی خایاند تا ئەو کات کە بە لێدوانەکانی (میلوان جیلاس) سەبارەت بە پارتی کۆمۆنیزمی یوگوسلاڤیای پێشوو دەگەین. ئەو لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی (چینی نوێ) دەڵێت کە لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا، پارت لە ڕێگەی پێکهاتەیەکی بۆرۆکراتیك کە کاربەدەستانی حیزبی وەك



چینێکی نوێ دەسەڵاتدار لە ترۆپکی حیزب دادەنێت، بەڕێوە دەبردرێت. ئەگەرچی دەکرێ سەبارەت بە چۆنێتی بەکار هێنانی زاراوەی ((چین)) رەخنە لە میلوان بگیردرێت، بەڵام بە سەختی دەکرێت رەخنە لە شیکردنەوەی ئەو سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵات لە کۆمەڵگا کۆمۆنیستییەکاندا، بگیردرێت.

چونکە بۆرۆکراسی حیزبی و حکوومی کارلێکیان هەیە، بۆیە رادەی ئەم کارلێککردنە بەپێی کارکردی دامەزراوە جۆراوجۆرەکانەوە جیاوازە، لە روانگەی جیلاس، کۆمەڵگای یۆگوسلاڤیای پێشوو لە رووی پێکهاتەی دەسەڵاتەوە وەك سیستەمێکی دوو لایەنە بووە کە سەرەڕای چاودێریکردنی دام و دەزگا جۆراوجۆرەکان بە سەر بۆرۆکراسی و حیزبدا جۆرە هاوسەنگی و کۆمەڵگایەکی پۆلۆرالیستی دروستکردبوو، توێژینەوەکانی جیلاس سەبارەت بە سەرهەڵدانی چینێکی نوێ لە کۆمەڵگا کۆمۆنیستییەکاندا وێکچوونی زۆری لەگەڵ شیکردنەوەی ((جیمز برنهام)) دا هەیە. برنهام لە سەر کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکانەوە توێژینەوەی کردووە بە بۆچوونی ئەو لە سەردەمی هەنۆکەدا بەڕێوەبەران لە بڕی خاوەن کۆمپانیا و دام و دەزگاکان کارەکان ئەنجامدەدەن و بە لەبەردەست بوونی گشت پێداویستییەکان، بە گرووپێکی باڵادەست لە کەرتی پیشەسازی کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان هەژمار دەکرێن، ئەم گرووپە بووەبە هۆی پەرەسەندنی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرە پرۆفشنالەکان. پێویستە لە بیرمان نەچێت کە زاڵبوونی چینی بەڕێوەبەران بە سەر دامودەزگا حکوومییەکانەوە زەمینە بۆ دوورخستنەوەی دەوڵەت و دام و دەزگا حکوومییەکان فەراهەم دەکات. بە چەشنێك کە لە قۆناغی دواتردا، ئەم چینە خۆی بە جیا لە دام و دەزگاکانی حکوومەت دەزانێت و بە سەربەخۆیانە کار دەکات. بۆ نموونە ئەمڕۆکە دەبینین کە زۆرێك لە یاساکان، لە دەرەوەی کۆنگرێسی ئەمریکادا دادەڕێژرێن، چونکە دامەزراوەکان لە داڕشتنی هێڵە ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و سوپادا رۆڵی گرنگیان هەیە.

لەوانەیە شیکردنەوەی برنهام هەندێ نائومێدکەر بێت، چونکە ئەو لە گشت توێژینەوەکانیدا بۆرۆکراسی بە شتێکی جەبری دەزانێت. بەڵام دەبێ ڕەچاو بکرێت کە سیستەمە بۆرۆکراتیکییەکان بە پێی ئەم سیستەمەی کە تیایدا کاردەکەن، لە رووی پەیوەندییانەوە بە گشت ستراکتۆرەکانی کۆمەڵگەوە (ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئایدیۆلۆژیکی و پەیوەندیکردن (اتصالات)) وەك بە کارناکەن. ترسی برنهام لەوەیە کە بە بڕوای ئەو گشت دامەزراوەکان لە سەرتاسەری جیهاندا لە رووی کارکردنەوە رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو بۆرۆکراتیزە بوون هەنگاو دەنێن. بەڵام ئەو ئاماژە ناکات بەو





ئامانجانەی کە بوونە هۆی دامەزراندنی دامەزراوە جۆراوجۆرەکان، یاخود چ کەسانێك لە ترۆپکی دامەزراوەکاندا کاردەکەن یاخود چۆن دەکرێ ئەم دامەزراوانە لە ناو ببرێن و چ جۆرە بزاوتگەلێك دەتوانن لە ناو پێکهاتەکانی دامەزراوەکاندا سەر هەڵبدەن. لە دەرەوەی بلۆکی کۆمۆنیزمدا. زۆربەی کۆمەڵناسان گرنگی ئەوتۆ بە پەرەسەندنی بۆرۆکراسی نەداوە. بەڵام زۆرتر جەخت لەوە کراوە کە ئەنجامە گرنگەکانی ئەم رەوتە [واتە پەرەسەندنی بۆرۆکراسی] بۆ پێداچوونەوە لە ستراکتۆری هێزی نەتەوەیی سوود وەربگیردرێت تا سەرەڕای کەمکردنەوەی زیانەکانی بۆرۆکراسی ببێتە هۆی کارامەیی و بەرزکردنەوەی بەهاکانی کۆمەڵگا.

لە پەرتووکی (تی. بی. باتامۆر) بە ناونیشانی ((نوخبەکان و کۆمەڵگا))، رەخنە لە دامەزراندنی خەڵك لە پۆستە بەرزەکانی دامەزراوەکاندا، دەگرێت بە بۆچوونی باتامۆر پۆستە بەرزەکانی قۆچکی دەسەڵات لە دامەزراوە کارگێڕییەکاندا لە لایەن کەسانێکەوە داگیرکراوە، کە سەرەڕای پسپۆڕ و شارەزا بوون لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی چینی سەرمایەدار کار دەکەن.

هەندێ جاریش پەیوەندی لە نێوان بۆرەکانی کۆمەڵایەتی، راهێنان و پسپۆڕێتی، هەروەها پەیوەندی لە نێوان بەرژەوەندییەکان و پابەند بوونی ئەم نوخبانە لە هەمبەر چینی دەسەڵاتدار (سەرمایەدار)دا، بە هیچ جۆرێك پاساو نانەوەی بۆ ناکرێت بە بۆچوونی ((میلی بند)) بۆرۆکراتەکان لە نێوان کەسانێك هەڵدەبژێردرێن کە بەپێی بەها بەرقەرارەکان، پەیڕەوی لە ئایدیۆلۆژیای بەرقەرار دەکەن و سەرەڕای پاراستنی بارودۆخی بەرقەرار، لە هەر جۆرە پێکدادانێك خۆیان دوور دەخەنەوە تەنانەت کاتێك کە بۆرۆکراتەکان دەسەڵات دەگرنە دەست، بە گێڕانی رۆڵی بێلایەن یارمەتی پاراستنی بارودۆخی بەرقەرار دەدەن. ((میلی)) بەڕەشبینییەوە دەڵێت کە چاوەڕوان نەکراوە کەسانێك کە ئەرکی هەڵسوڕاندنی کاروباری وڵات لە ئەستۆ دەگرن، بەرژەوەندی خەڵك لە پێشەوەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان دابنێن، بەڵگەنەویستە لە زۆرێك لە کۆمەڵگاکانی سەرمایەداریدا، بۆرۆکراسی و دام و دەزگاکانیان، رۆڵی ناوبژیوان لە نێوان خواستە دژ بە یەکەکانی کۆمەڵگادا دەگێڕن، بەم جۆرەش دامەزراوەی بۆرۆکراسی گرنگترین جیاوکە کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسییەکان بۆ چینی سەرمایەدار تەرخاندەکەن.

یەکێك لە قوتابخانەکان کە هێرش دەکاتە سەر بۆچوونی مارکسیستەکان سەبارەت بە بۆرۆکراسییەوە قوتابخانەی لۆرالیستە. هەر وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، مۆسکا یەکێك لەو کەسانە بوو کە دامەزراوە ئابووری و سیاسییەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری بە فاکتەرگەلی بەربەست نانەوە



بۆ ناوەندگەرا بوونی (چەق بەشی) دەسەڵات هەژمار دەکرد. بە بڕوای ئەو ناوەندگەرایی، بەشێکی جیانەکراوی سیستەمی سۆشیالیستییە، بەم جۆرەش لێکدانەوەی مۆسکا بۆ واقیعییەتەکان وێکچوونی زۆری لەگەڵ شیکردنەوەکانی بیردۆزگەلی وەك ((میلی بند))ی هەیە. جیاوازبۆچوون لە نێوان ئەم دوو کەسە لەوەدایە کە مۆسکا هێزی سەرمایەداران بە فاکتەری لەمپەرناوە بۆ بەردەم بەرزبوونەوەی هێزی دەوڵەت و بۆرۆکراسی دەزانێت، بەڵام ((میلی بند)) هێزی دەوڵەت و هێزی سەرمایەدار لە ئەنجامی سیستەمێکی وێکچوو بۆ زاڵبوونی چینایەتی هەژمار دەکات. لە لایەکیترەوە پۆلۆرالیزمە هاوچەرخەکان بە واقیع بینییەوە خوێندنەوەی لێکدانەوەی مارکسیستەکان سەبارەت بە دەوڵەت و بۆرۆکراسی دەکەن، بیردۆزگەلی وەك ((دال))، ((لیپست)) و ((ئارۆن)) و ((گالبرایت)) لە سەر ژیدەرەکانیتری دەسەڵات ورد دەبنەوە. بە چەشنێك کە ئەوان دامەزراوەگەلی وەك یەکێتی کرێکاران، پارتە سیاسییەکان و رێکخراوە خۆبەخشەکان بە فاکتەری دروستکردنی هاوسەنگی لە نێوان هێزی دەوڵەت و هێزی سەرمایەداران دەزانن و گرنگی زۆر بەم دامەزراوانە دەدەن، بۆیەش، دەرەنجامی هزری ئەم بیردۆزانە لە تیۆری نوخبەی دیموکراتیکدا بەرجەستە بووە. ئەم تیۆرییە تێکەڵێکی خۆشبینانەیە لە کۆمەڵناسی سیاسی و فەلسەفەی سیاسی کە لە زۆر بابەتدا دژی تیۆری رەشبینانە و پارێزگارانەی مۆسکا دەوەستێتەوە.

شرۆڤەکارانی تیۆری پۆلۆرالیزمی هەوڵیانداوە بۆ نەهێشتنی تارمایی و گومان توێژینەوەکانی کەسانی وەك ڤێبر مۆسکا و میشل سەبارەت بە توانایی سیاسەتمەدارانی هەڵبژاردراو بۆ کونترۆڵ کردنی ماشینی بۆرۆکراسی.

چەقی پشت پێوە بەستنی تیۆری پۆلۆرالیزمی هێزە دەسەڵاتدار و دەسترۆیەکانە کە لە دەرەوەی ژینگەی فەرمی سیاسی، پاڵپشتی لە سیاسەتمەدارە هەڵبژێردراوەکان دەکەن. ئەگەرچی ئەم تیۆرییە بە هیچ جۆرێك وێکچوونی لەگەڵ تیۆری ئایدیالیستی ((دیموکراسی راستەوخۆی)) نییە، بەڵام سیستەمی پۆلۆرالیزم هەلومەرجێك دەخولقێنێت کە گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان یەکتر کونترۆڵ دەکەن و بەم جۆرەش دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و دواجار بۆرۆکراسی سنووردار دەکرێت، لە خوێندنەوەی چۆنێتی کارکردی ئەم سیستەمانە دەبینین کە بە هۆی گوشاری هەمە لایەنەی بۆرۆکرات و سیاسەتمەدارانەوە، زۆرینە ناتوانێت بە سادەیی بە سەر کەمینەدا فەرمانڕەوایی بکات کەم و کوڕی ئەم سیستەمانە لەوەدایە کە چونکە هەر جۆرە نوێگەری و بڕیارە گرنگەکان دەبێتە هۆی بەرپەرچدانەوەی

بەرهەڵستکاران دژی بۆرۆکراسی، بۆیە بۆرۆکراتەکان بە پارێزگارییەوە هەڵسوکەوت دەکەن و هانی حکوومەت دەدەن بۆ پاراستنی بارودۆخی بەرقەرار. هەڵبەت گرتنەبەری ئەم شێوازە پێشێلکردنی بنەماکانی دیموکراسییە و گوشاری گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی دەبێتە هۆی ئیفلیج بوونی خزمەتگوزاری گەیاندن بە کۆمەڵگا. ئەم پرسەش زەمینە بۆ تاوانبار کردنی بۆرۆکراسی بە نالێهاتوویی و ناکارامەیی فەراهەم دەکات. بەم جۆرەش دەبینین کە ئەم شێوازەی پۆلۆرالیزمەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی بۆرۆکراسی دەگرنەبەر، تەنیا لە بۆرۆکراتیزە بوونی سیستەمی سیاسی کەم ناکاتەوە. بەڵکو خودی خۆی دەبێتە هۆی لەناوبردنی بەها دیموکراتیکەکان، بۆیەش ((سی. رایت میلز)) سەرەڕای لێکدانەوەی رەشبینانە لە سەر بۆرۆکراسی، دەڵێت کە ((لیبرالێزم)) زۆرتر رەچاو ئازادی و تاکگەرایی دەکات، بەڵام مارکسیزم رەچاوی رۆڵی مرۆڤ دەکات لە دروستکردنی مێژووی سیاسیدا. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچی شێوازەکانی ئازادی و... لە کۆمەڵگا سەرمایەداری و کۆمۆنیستییەکانی سەردەمی ئەمرۆ تا ئەم رادەیە لێل و تارماییە، لێرەوە دەزانین کە بۆچی لیبرالیزم بە دەرباز بوونی لە رێگەیەکی لێك دابڕاو بۆ داپۆشینی راستییەکان، روخساری خۆی دادەپۆشێت، چونکە لیبرالێزم ناتوانێت زۆرێك لە رەوتە سەرەکییەکانی شیکردنەوەیان بۆ بکات ئەو دەڵێت کە گشت کەم و کورییەکانی ئەم سەردەمە هەڵقوڵاوی پەرەسەندنی لە رادەبەدەری بۆرۆکراسییە، کە هیچ یەك لە تیۆرییە سیاسییەکانی ناوبراو (مارکیسزم و لیبرالیزم) نەیانتوانیووە روونکردنەوەیەکی لۆژیکییانە بۆیان بدۆزنەوە.

بۆرۆکراسی، تاکەکان دەکات بە داشێکی بێ بایەخ و بە لیسەندنەوەی ئازادی، لەمپەر و گرفتی فراوان بۆ بووژانەوەی تواناییەکان دەخولقێنێت. لەوانەیە یەکێك لە بەرپەرچدانەوەی رۆژئاواییەکان بۆ ئەم دیاردەیە سەرهەڵدانی ((بان ماتریالیزم)) بێت. چونکە بە پراکتیکەوە سەلمێنراوە کە بۆرۆکراتیزە بوونی دام و دەزگای حیزب و سەندیکاکان دەبێتە هۆی لەمپەر نانەوە لە بەردەم بەرفراوان بوونی بەشداری سیاسی و بەشدار بوونی تاکەکان لە دیارکردنی چارەنووسیاندا. هەر بۆیەش لەم ساڵانەی دواییدا رادەی وەفادار بوونی خەڵك بە پارتە سیاسییەکان کەم بووەتەوە مەیل بۆ چوونە ناو دامەزراوەگەلی وەك بزاڤە ئاشتی خوازەکان، لایەنگرانی ژینگە و.... دەبینرێت ئەم جۆرە وەرچەرخانە لە رەفتاردا بووە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ بە روانینێکی نوێیەوە بڕوانێتە ژیان و ژینگەی دەوروبەری و لە هەمبەر بۆرۆکراتیزە بوونی کۆمەڵگادا، هزر لە سەربەخۆیی خۆی و رزگار بوون لە کۆت و بەندەکانی بۆرۆکراسی بکاتەوە.